زانکۆی کەرکوک



# یاسای جێبەجێکردن
# قانون التنفيذ

سکان

ئالا کامەران

کۆمیتەی خوێندکارانی یاساو رامیاری

کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان
Kurdistan students association
جمعية طلبة كردستان

لقی زانکۆ و پەیمانگاکانی کەرکوک

# یاسای جێبەجێ کردن

**کتێبی مەنهەجی ئەمساڵ:**

- مدحت المحمود(القاضي)، شرح قانون التنفيذ،ط٢، المكتبة القانونية، بغداد، 2011.

**ئەم کتێبانەش بخوێنەوە:**

- أ. د. سعيد مبارك، احكام قانون التنفيذ رقم 45 لسنة 1980، ط٤، المكتبة القانونية، بغداد، 2011.
- د. عصمت عبدالمجيد، تنفيذ الاحكام و المحررات - شرح احكام قانون التنفيذ رقم 45 لسنة ١٩٨٠ المعدل في ضوء التطبيقات القضائية، جامعة جيهان، اربيل، ٢٠١٢.

## خالص احمد حمد

### جێبەجێ کردن چییە؟

جێبەجێکردن بە ئەنجامگەیاندنی پابەندبونی یاساییە بەجۆرێك کە ئەستۆی قەرزار لە پابەندبونەکە بەتەواوی پاك بێتەوە.

### پێناسەی یاسای جێبەجێ کردن:

ئەو رێسا یاساییانەیە کە کۆمەڵێك ئیجرائاتی تایبەت رێك دەخا کە دەسەڵاتی گشتی دەیگرێتە بەر بۆ ناچار کردنی قەرزار بۆ ئەنجامگەیاندنی پابەندبونەکەی ئەگەر خۆی ئارەزومەندانە بەجێی نەگەیەنێ.

### بۆچی یاسای جێبەجێکردن پێویستە؟

- بۆ نەهێشتنی دروستبوونی ئاژاوە لە کۆمەڵگە:
- بۆ پاراستنی بەرژەوەندی گشتی:
- بۆ ئەوەی جێبەجێکردنی پابەندبوون نەکەوێتە دەست هەوا و هەوەسی خاوەن قەرز و قەرزار:

### ئامرازە یاساییەکانی جێبەجێکردن لە عێراق لە کۆنەوە تا ئێستا:

١- لە سەردەمی عوسمانی و دواتر تا دوا ساڵەکانی سەردەمی پاشایەتی لە عێراق **فەرمانگەی رێکارەکان** "دایەرەی ئیجرائات" هەبوو، کاری جێبەجەکردنی بڕیاری دادگا بووە.

٢- یاسای جێبەجێکردن ژمارە ٣٠ساڵی ١٩٥٧ .

یاسای جێبەجێکردن ژمارە ٤٥ ساڵی ١٩٨٠ ئێستا دوای چەند هەموارکردنێك لە عێراق و هەرێمی کوردستان کاری پێدەکرێ.

٣- **فەرمانگەی** جێبەجێکردن لە چەندین بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن لە سەرانسەری عێراق و هەرێمی کوردستان پێکدێ کە لە مەرکەزی پارێزگا و هەموو ئەو شوێنانە هەیە کە دادگای بەرایی لێیە.

## یاسای جێبەجێکردنی ژمارە ٤٥ ساڵی ١٩٨٠

لە چوارچێوەی بزوتنەوەی چاکسازی سیستمی یاسایی دەرچوو بۆ ئەوەی لەگەڵ واقیعی نوێی ئەوسای عێراق کە بەعسیەکان پێیان وابوو سیستمی سیاسی عێراق سیستمێکی سۆشیالیستی تایبەتە.

ئەم یاسایە بە پشت بەستن بە یاسای چاکسازی سیستمی یاسایی ژمارە ٣٥ ساڵی ١٩٧٧ پێکهاتەیەکی نوێی دەزگای جێبەجێکردنی لە عێراق لەگەڵ خۆی هێنا.

### بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بۆ چییە؟

بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن هەوڵ دەدا لە چوارچێوەی یاسا ماف بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە جا ئارەزومەندانە بێ یان دوای ئەوەی بەزۆر لە قەرزاری دەسەنێ. بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بە جێبەجێکردنی بڕیاری دادگا و هەندێك نوسراوی دی کە یاسا دەسنیشانی کردوە ئەم کارە دەکا.

**کەواتا جێبەجێ کردنی حوکم ( تنفیذ الاحکام ) لە عێراق و کوردستان ناچێتە ژێر ئەو بابەتانەی کە یاسای دادبینی شارستانی ڕێکیان دەخات، بەڵکو یاسایەکی تایبەت ئەم کارە ئەنجام دەدات ئەویش یاسای جێبەجێ کردنی عێراقییە (قانون التنفیذ) ژمارە (٤٥) بۆ ساڵی ١٩٨٠، وە یاسای جێبەجێکردن بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردنی ڕاسپاردووە بۆ ئەم کارە، ئەمەش پێچەوانەی زۆربەی یاسای وڵاتە عەرەبیەکانە کە جێبەجێ کردنی حوکم بەشێکە لە یاسای دادبینی شارستانی.**

## ئامانجەکانی یاسای جێبەجێکردن

لە ڕاپەڕاندنی کارەکانیدا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن دەبێ پابەند بێ بە بەدیهێنانی ئامانجەکانی یاسای جێبەجێکردن کە ئەمانەی خوارەوە ئامانجە سەرەکییەکانە:

### یەکەم- پاراستنی بەرژەوەندی دەوڵەت (بەرژەوەندی گشتی):

لە مامەڵەی نێوان دەوڵەت و تاکەکەس دا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن هەوڵ دەدا تا ئەوەندەی یاسا ڕێگای داوە بەرژەوەندی دەوڵەت پێش بەرژەوەندی تاکەکەس بخا، ئەمانە چەند نمونەیەکن:

١- کە دەوڵەت قەرزارە: بڕیاری دادگا تاوەکو پلەی بڕاوە (**بنبڕ**) وەرنەگرێ ناتوانرێ لە دژی دەوڵەت جێبەجێ بکرێ.

٢- کە دەوڵەت قەرزارە: ٣٠ ڕۆژ بواری دەدرێتێ بۆ ئەوەی ئارەزومەندانە قەرزەکەی بداتەوە (م ٢٠).

٣- کە دەوڵەت خاوەن قەرزە: ئەگەر قەرزارەکە نکوڵیش لە دروستی سەنەدەکە بکا، جێبەجێکردنی سەنەد دواناخرێ و دادگا بۆی نیە بڕیار بە دواخستنی جێبەجێکردنی سەنەدەکە دەربکا (م ٢٦).

٤- کە دەوڵەت خاوەن قەرزە: بەشی بەدواداچون لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن، بەدواداچون بۆ سەندنەوەی قەرزەکانی دەوڵەت دەکا.

٥- کە دەوڵەت خاوەن قەرزە: بۆ سەندنەوەی قەرزی دەوڵەت دەکرێ حیجز (**دەست بەسەر**) لەسەر بەشێك لە موچە و دەرماڵەی فەرمانبەر- جا مەدەنی بێ یا عەسکەری- دابنرێ پێش ئەوەی بڕیاری دادگا پلەی بڕاوەیی (درجة البتات) وەربگرێ.

### دووەم- پاراستنی مافی تاکەکەس و ڕاگرتنی هاوسەنگی لە نێوان بەژەوەندی قەرزار و خاوەن قەرز:

١) جێبەجێکاری داد دەتوانێ ڕێگە نەدا بە فرۆشتنی عەقاری حیجزکراو ئەگەر بەروبومی ساڵێکی عەقارەکە **بەس** بێت بۆ دانەوەی قەرزەکە (م ٩٠).

٢) ڕێـگە نەدان بە فرۆشـتنی خـانوی **نیـشتەجیٚ بـوونی** قەرزار و خێـزانەکەی، یان ئەو عەقـارەی کە لەسـەر بەروبومەکەی دەژین (م ٦٤).

٣) ڕێگە نەدان بە فرۆشتنی عەقاری حیجزکراو ئەگەر ئەو نرخەی لە زیادکردنی ئاشکرا پێی دەدرێ لە (٧٠%) ی نرخی خەملێنراوی عەقارەکە کەمتر بێت (م ٧٣).

٤) دەشـێ ئەو مـولکە پێویـستەی کە ناکرێ حیجـز بکـرێ بەڵام لە پێویـستی قەرزار زیادە، بفـرۆشرێ و بەشـێك لە پارەکەی بدرێ بە قەرزار کە کافی و **بەس** بێ بۆ کڕینی پێداویستی گونجاو و باقیەکەی بۆ دانەوەی قەرزەکە بەکاربهێنرێت (م ٥٩).

٥) حیجز نەکردنی موچە و دەرماڵەی قەرزار تەنها لە هەندێك حاڵەتی دیاریکراو و بە ڕێژەی دیاریکراو نەبێ.

٦) یاسا ڕێگا نادا قەرزار زیندانی بکـرێ ئەگەر نەبون بێ، یان (١٨) سـاڵ تەمەنی تەواو نەکردبێ یان لە سـەروی (٦٠) ساڵانەوە بێ (م ٤١).

٧) ئەگەر قەرزار لە زیندان توشی نەخۆشیەك بێ کە ئومێدی چاکبونەوەی نەبێ، ئەوا دەبێ ئازاد بکرێ (م ٤٦).

٨) نابێ کاری جێبەجێکـردن لە مـاوەی نێـوان سـەعات (٩) ی شـەو تا (٦) ی بەیانی یان لە ڕۆژانی جەژن و پـشودا بکرێ، وە لە حاڵەتی زەرورەتدا دەبێ بە بڕیاری جێبەجێکاری داد بێ (م ٢٣).

## سێیەم- ئاسانکردنی ئیجرائاتی جێبەجێکردن:

١) یاسـای جێبەجێکـردن هەوڵ دەدا جێبەجێکـردنی بـڕیار و سـەنەدەکان دوانەکەون و جێبەجێکـردن بە کات و ئەرك و **خەرجی** کەم ئەنجام بدرێ.

٢) داواکاری جێبەجێکردن دەتوانێ موراجەعەی هەر بەڕێوەبەرایەتیەکی جێبەجێکردن بکا (واتە نەبونی تایبەتمەندی شوێنی م ٢٤).

٣) دەشێ بڕیاری دادگا پێش وەرگرتنی پلەی بڕاوەیی (درجة البتات) جێبەجێ بکرێ. لە هەنـدێك حـاڵەتی دایاریکـراو نەبێ.

## چوارەم- هاندانی هاوڵاتیان ئارەزومەندانە جێبەجێکردن ئەنجام بدەن:

لێخۆشبون لە سەندنی رسوماتی دادوەری (الرسومات العدلیة) کە مەبلەغێکی بڕاوەیە ئەگەر قەرزار لە ماوەی دیاریکـراو قەرزەکەی ئارەزومەندانە بداتەوە (م ١٨). زۆربەی جار ماوەی دیاریکراو ( ٧) ڕۆژە لە ڕۆژی دوای گەیشتنی پێراگەیانـدنی جێبەجێکردنەوە، بەڵام ئەگەر دەوڵەت قەرزار بێ (٣٠) ڕۆژ بواری دەدرێتێ بۆ دانەوەی قەرزەکە (م ٢٠).

## دەزگای جێبەجێکردن لە عێراق

یاسای جێبەجێکردنی ژمارە ٤٥ ساڵی (١٩٨٠) پێکهاتەیەکی نوێی دەزگای جێبەجێکردنی لە عێراق لەگەڵ خۆی هێنا .

دامەزراندنی فەرمانگەیەکی گشتی جێبەجێکردن لە بەغدا بە ناوی (فەرمانگەی جێبەجێکردن – دائرة التنفیذ).

دامەزرانـدنی بەڕێـوەبەرایەتی جێبەجێکـردن لە گـشت پارێزگـاکان و لە هەمـو ئەو شـوێنانەی کە دادگـای بەرایی (محکمـة البداءة) ی لێیە (م ٦).

هەمو بەڕێوەبەرایەتیەکانی جێبەجێکردن (مدیریات التنفیذ) لە عێراق بەسراونەتەوە بە فەرمانگەی جێبەجێکردن (دائرة التنفیذ) لە بەغدا.

فەرمانگەی جێبەجێکردن (دائرة التنفیذ) لە بەغدا بەسراوەتەوە بە وەزارەتی داد (م ٤ پ١).

## فەرمانگەی جێبەجێکردن لە بەغدا (دائرة التنفیذ):

فەرمانگەی جێبەجێکردن لە بەغدا بەڕێوەبەرێکی گشتی سەرۆکایەتی دەکا کە بەکالۆریۆسی یاسا و ١٢سال خزمەتی یاسایی هەبێ، **وە دروستە لەلایەن دادوەرێکی پۆلی یەکەم یان دووەمەوە بەڕێوەببرێت** (م٤ پ٢).

**وە فەرمانگەی جێبەجێکردن بەدواداچوونی کارەکانی بەڕێوەبەرایەتییەکانی جێبەجێکردن دەکات و کەم وکوڕیەکانی دەستنیشان دەکات** (م٤ ب٣).

فەرمانگەی جێبەجێکردن لە بەغدا لەم بەشانە پێکهاتوە (م ٤):

١- پلاندانان و ئامار (قسم التخطیط والاحصاء)

٢- پەیوەندیە یاساییەکان (قسم العلاقات القانونیة)

٣- کاروباری دارایی (قسم الشؤون المالیة)

٤- کاروباری کارگێری (قسم الشؤون الاداریة)

سەرۆکی ئەم بەشانە دەبێ بەکالۆریۆسی لە پسپۆڕی بەشەکەدا هەبێ.

## بەڕێوەبەرایەتیەکانی جێبەجێکردن لە هەرێمی کوردستان

بەگوێرەی یاسای وەزارەتی دادی هەرێمی کوردستان، ژمارە (١٣) ساڵی ٢٠٠٧، مادەی (٤) بەڕێوەبەرایەتیەکانی جێبەجێکردن لە هەرێمی کوردستان بەسراونەتەوە بە (بەڕێوەبەرایەتی گشتی فەرمانگەکانی داد).

بەڕێوەبەرایەتی گشتی فەرمانگەکانی داد سەر بە وەزارەتی دادە لە حکومەتی هەرێمی کوردستان.

جێبەجێکاری داد بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بەڕێوە دەبا کە فەرمانبەرێکی یاساییە بەکالۆریۆسی لە یاسا هەیە و دەبێ (٣) ساڵ خزمەتی یاسایی هەبێ.

ئەگەر بەڕێوەبەرایەتییەکی جێبەجێکردن جێبەجێکاری دادی نەبێ ئەوا دادوەری پلە یەکی دادگای بەرایی کارەکانی جێبەجێکاری داد دەکا. (م ٦/ خامساً)، **بەلاّم ئێمە وا دەبینین کە ئەم ماددەیە ئیستا ناکرێ جێبەجێ بکرێت چونکە دادگاکان جودابوونەوە لە وەزارەتی داد لە پاش دەرچوونی یاسای دەسەلاّتی دادوەری هەریمی کوردستان ژمارە (٢٣)ی ساڵی ٢٠٠٧**.

**بەڕێوەبەرایەتیەکانی جێبەجێکردن لەم هۆبانە پێك دێن:**

**یەکەم- هۆبەی ئەمینداریێتی جێبەجێکردن (هۆبەی تۆمار):**

١) بڕیاری دادگا و بەڵگەنامەکانی جێبەجێکردن (المحررات التنفیذیة) لە موراجیع وەردەگرێ و لە تۆماری بنەڕەت تۆماری دەکا.

٢) دۆسیە و کارت (اضبارة و بطاقة) بۆ هەر معامەلەیەك دەکاتەوە.

٣) ڕاپەڕاندنی کاروباری جێبەجێکردن و پەیوەندیکردن بە لایەنەکان تاوەکو معامەلەکە تەواو دەبێ. کە معامەلەکە تەواو بو دۆسیە و کارتەکە بۆ هۆبەی ئەرشیف دەنێرێ بۆ هەلگرتنیان.

٤) ئەگەر خاوەن قەرز و قەرزار پێك بێن (تەسویە بکەن)، تەسویەکە تۆمار دەکرێ و دۆسیە و کارتەکە بۆ هۆبەی ئەرشیف دەنێرێ بۆ هەلگرتنیان.

**دووەم– هۆبەی ژمێریاری:**

١) رسومی جێبەجێکردن لە داواکاری جێبەجێکردن وەردەگرێ و دەیدا بە گەنجینە.

٢) کارتەکان لە هۆبەی ئەمینداریێتی وەردەگرێ و کاری ژمێریاریان لەسەر ڕایی دەکا.

٣) ئەمانەت (ڕاسپاردە -الامانات) لە قەرزار وەردەگرێ و لە بانکیان دادەنێ.

٤) ئەگەر خاوەن ماف نەهات بۆ وەرگرتنی ئەمانەتەکە ئەوا تەسلیم بە گەنجینەی دەکات.

٥) ئەگەر قیست لە کاتی خۆی نەدرا هۆبەی بەدواداچونی لێ ئاگادار دەکاتەوە.

٦) لە کاتی دیاریکراوی خۆی، کە بەڕێوەبەری گشتی دایدەنێ، پارە دەداتەوە خاوەن ماف .

**سێیەم– هۆبەی بەدواداچون:**

١) بەدواداچونی دانی قیستەکان لەلایەن قەرزارەوە دەکات.

٢) پێڕاگەیاندنەکان ئەنجام دەدا و بەدواداچونیان بۆ دەکا.

٣) خاوەن قەرز ئاگادار دەکاتەوە ئەگەر هەرشتێك لە قەرزار بۆی وەرگیرابێ.

٤) ڕێنمایی موراجیعەکان دەکا و ئامۆژگاری پێویستیان پێشکەش دەکا.

**چوارەم– هۆبەی ئەرشیف:**

١) هەمو ئەو دۆسیە و کارت و دۆسیەانەی بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن کە کاریان تەواو بوە هەلدەگرێ و دەپارێزێ.

٢) زانیاری لەسەر نوسراوی هاتو و دەرچو لە تۆماری تایبەت تۆمار دەکەن.

**پێنجەم– هۆبەی خۆیەتی و خزمەتگوزاری:**

ئەمە پەیوەندیدارە بە کاروباری ناوخۆی بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن و ڕاژەی کارمەندەکانیان.

**شەشەم– هۆبەی کاروباری بەڕێوەبەرایەتیەکان:**

ئەم هۆبەیە تەنها لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردنی مەرکەزی پارێزگاکان هەیە، تەنسیق دەکا لە نێوان کاری هەموو ئەو بەڕێوەبەرایەتیانەی جێبەجێکردن کە لە پارێزگاکەدا هەن.

## تایبەتمەندی وەزیفەیی بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن
## (وەزیفەی بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن چییە؟)

بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن تایبەتمەندە بە جێبەجێکردنی سەنەداتی جێبەجێکردن (سندات التنفیذ) کە بڕیاری دادگا دەگرێتەوە لەگەڵ ئەو نوسراوانەی کە بەپێی یاسا شیاوی جێبەجێکردنن، ئەگەر یەکێك لەم بەلگەنامانەت لا بێ دەتوانی داوا لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بکەی لە چوارچێوەی یاسا مافەکانی ناو بەلگەنامەکەت بۆ بسەنێتەوە.

ئەگەر کاری بەڕێوەبەرایەتیەکانی جێبەجێکردن نەبێ ئەو بڕیار و نوسراوانە لەوانەیە وەك دۆکیومێنتێکی کەم بایەخ بمێننەوە.

## سەنەداتی جێبەجێکردن لە چی پێکدێ؟

ئەو سەنەدانەی کە دەشێ جێبەجێ بکرێن لەمانە  پێکدێن:

١- بڕیاری دادگا (الاحکام القضائیة - حوکمی دادوەری).

٢- بڕیاری دادگای بیانی کە دەشێ بە مەرج لە عێراق جێبەجێ بکرێ (م ٣).

٣- هەندێك نوسراوی دیاریکراو هەن کە شیاوی جێبەجێکردنن کە (یاسای جێبەجێکردنی ساڵی ١٩٨٠) یان یاسای دیکە دەسنیشانیان دەکا کە پێیان دەگوترێ نوسراوی جێبەجێکردن (المحررات التنفیذیة) وەك چەك و کومپیالە.

پرسیار: ئایا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن دەتوانێ نوسراوێك جێبەجێ بکا کە یەکێك نەبێ لەو نوسراوانەی کە یاسای جێبەجێکردن دیاریکراوە یان ئاماژەی پێدراوە؟

وەڵام: نەخێر، بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ناتوانێ هیچ سەنەدێك جێبەجێ بکا ئەگەر بڕیاری دادگا نەبێ یان یاسای جێبەجێکردن بە ئاشکرا و شێوەی سنووردار (حصر) دیاری نەکردبێ یان ئاماژەی پێ نەدابێ.

## یەکەم: حوکمی دادوەری عێراقی
## (الاحکام القضائیة العراقیة)

حوکمی داوەری (بڕیاری دادگا):

حوکمی داوەری ئەو بڕیارانە دەگرێتەوە کە دادگایەکی پسپۆر لە عێراق، کە بەشێوەیەکی دروست پێکهاتبێ، دەری دەکا بۆ یەکلایی کردنەوەی ئەو کێشانەی کە بۆیان بەرزدەکرێنەوە.

حوکمی داوەری گرنگترین سەنەدی جێبەجێکردنە و لە بەرامبەر قەرزار لە سەنەدەکانی تر بەهێزترە چونکە لە دادگا دەرچوە و چەندین ڕێکار لەبەرچاو گیراوە تا مافی لایەنەکان پێشێل نەکرێ.

نمونە: بڕیاری دادگای بەرایی (البداءة) بە دانەوەی قەرز.

بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ئەو بڕیارانەی دادگا جێبەجێ دەکا کە لەم کەیسانە دەرچوە:

مەدەنی،

بازرگانی،

ئەحوال شەخسی.

**پ**/ ئایا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بۆی هەیە بڕیاری جینائی جێبەجێ بکا؟

**وەڵام**: بڕیاری جینائی بڕیارێکە لە دادگایێکی جینائی وەك دادگای کەتن (محكمة الجنح) یان دادگای جینایات (محكمة الجنايات) دەرچوە.

لە بڕیاری جینائی ئەو **بڕگانەی** کە پەیوەندی بە قەرەبوو کردنەوە (تعويض) هەیە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن دەتوانی جێبەجێیان بکا.

بەڵام **بڕگەیەی** پەیوەندیدار بە غەرامە بەگوێرەی (یاسای سەندنەوەی قەرزی دەوڵەت ساڵی ١٩٧٧) دەسەنرێتەوە و دەدرێ بە دەوڵەت و لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن جێبەجێ ناکرێ. کەواتە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن هەقی بەسەر غەرامەوە نیە و جێبەجێی ناکا.

## ئەو مەرجانە چین کە دەبێ لە حوکمی دادگادا هەبن بۆ ئەوەی بتوانرێ جێبەجێ بکرێ؟

### ١- دەبێ حوکمەکە لە یەکێك لە دادگاکانی عێراق دەرچوو بێ (م ٩):

وەك ڕێسایەکی گشتی بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن تەنها ئەو حوکمە دادوەریانە جێبەجێ دەکا کە لە دادگاکانی عێراق دەرچونە.

وەك ئیستیسنا هەندێك حوکمی دادگای بێگانە لە عێراق دەشێ جێبەجێ بکرێن بەگوێرەی (یاسای جێبەجێکردنی بڕیاری دادگای بێگانە لە عێراق ژمارە ٣٠ ساڵی ١٩٢٨) و هەندێك پەیماننامەی نێودەوڵەتی.

**٢- دەبێ حوكمەكە لە عەیبی تەزویر بە دور بێ:**

رێكارەكان چین ئەگەر لایەنێك لای بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێكردن تانەی لە دروستی بڕیاری دادگا دا، بۆ نمونە گوتی بڕیارەكە هەموی یان بەشێكی تەزویر كراوە؟

١) تەنها لایەنەكانی معاملەی جێبەجێكردن (وەك قەرزار، خاوەنقەرز یان كەفیل) دەتوانن تانەی تەزویر لە بڕیاری دادگا بدەن.

٢) ئەگەر لایەنێك تانەی لە دروستی بڕیارەكە دا ئەوا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێكردن سەیری دەقی بڕیارەكە دەكا بۆ ئەوەی بزانێ هیچ رەشكردنەوە یان خەتبەسەرداهێنان یان زیادكردنی بێ ئیمزای لەسەرە، یان هەر شتێكی دی كە گومان لەسەر دروستی بڕیارەكە دروست بكا.

٣) ئەگەر جێبەجێكاری داد هەر گومانێكی لەسەر دروستی بڕیارەكە لا دروست بوو ئەوا دەبێ یەكسەر رێكارەكانی جێبەجێ كردن بوەستێنێ.

٤) دەبێ بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێكردن بڕیارەكە بۆ ئەو دادگایە بنێرێتەوە كە بڕیارەكەی دەركردوە بۆ دڵنیابون لەوەی تەزویری تێدا نیە.

٥) ئەگەر دەركەوت تەزویری تێدا نیە ئەوا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێكردن دەست دەكاتەوە بە جێبەجێكردنی بڕیاركە.

٦) بەڵام ئەگەر دەركەوت تەزویری تێدایە ئەوا ئیدی بەهیچ شێوەیەك جێبەجێی ناكا (م ١٢ لە یاسای ئیسبات ساڵی ١٩٧٩).

ئەو كەسەی كە تۆمەتبارە بە تەزویركردن دەكەوێتە بەر حوكمی یاسای سزادانی عێراقی و یاسا جینائیەكان (وەك یاسای ئوسول موحاكەماتی جەزائی).

**٣- دەبێ حوكمەكە هەمو مەرجە شەكلیەكانی (رووكەشیەكان) تێدا بێ (م ١٦٢ و ١٦٣ لە یاسای مورافەعاتی مەدەنی ساڵی ١٩٦٩):**

١) دەبێ ناوی ئەو دادگایەی تێدا بێ كە بڕیارەكەی دەركردوە.

٢) دەبێ بەرواری دەرچونی بڕیارەكەی تێدابێ.

٣- دەبێ ناوی لایەنەكانی داوایەكەی تێدا بێ، ئەوەی حوكمی بۆ دەرچوە (المحكوم له) لەگەڵ ئەوەی كە حوكمی بەسەردا دراوە (المحكوم علیه).

٤- دەبێ ناوی دادوەر یان دادوەرەكانی تێدابێ. دەبێ واژوی دادوەری لەسەر بێ، ئەگەر زیاتر لە یەك دادوەر بو ئەوا واژوی سەرۆكی دەستەكە.

٥- دەبێ مۆری دادگای بەسەرەوە بێ.

**پرسیار: حوكمی یاسا چیە ئەگەر بڕیاری دادگا مەرجی شەكلی تێدا نەبوو؟**

وەڵام: ئەگەر بڕیاری دادگا یەکێك لە مەرجە شەکلیەکانی تێدا نەبو، ئەوا داواکاری جێبەجێکردن تێدەگەیەنرێ کە بڕواتە دادگا و داوای چاککردنی عەیبە (یان کەموکورتیە) شەکلیەکە بدا. تاوەکو عەیبە شەکلیەکە چارەسەر نەکرێ ناتوانرێ بڕیاری دادگا جێبەجێ بکرێ.

**٤ – دەبێ حوکمەکە فەرمانێکی تێدا بێ بە کردنی یان نەکردنی شتێك یان ڕادەستکردنی شتێکی دیاریکراو لەلایەن قەرزارەوە:**

بۆ نمونە:

- بڕیاری دادگا حوکم بەسەردادراو (المحکوم علیه) پابەند بکرا بە کردنی شتێك: بۆ نمونە قەرزار کە قەرزەکە بداتەوە.

- بڕیاری دادگا حوکم بەسەردادراو پابەندبکرا بە نەکردنی شتێك: بۆ نمونە ڕێگری نەکا لەوەی حوکم بۆدراو (المحکوم له ) دیوارێکی دیاریکراو بروخێنێ.

- بڕیاری دادگا حوکم بەسەردادراو پابەند بکرا بە ڕادەستکردنی شتێك: بۆ نمونە کرێنشین پابەند بکرێ عەقارەکە چۆڵ بکا و ڕادەستی خاوەنەکەی بکا.

**٥– دەبێ حوکمەکە لەلایەن دادگایەکی پسپۆڕ و تایبەتمەندەوە دەرچو بێ:**

دەبێ ئەو دادگایەی بڕیارەکەی دەرکردوە تایبەتمەند بێ بە دەرکردنی ئەم جۆرە بڕیارە. ئەگەر بڕیارەکە لە دادگایەك دەرچوو بوو کە پسپۆڕ نەبێ ئەوا جێبەجێ ناکرێ.

تایبەتمەندێتی جۆری دادگاکان لەلایەن (یاسای دەسەلاتی دادوەری هەرێمی کوردستان و مورافەعاتی مەدەنی ساڵی ١٩٦٩) دیاریکراوە .

**پرسیار: حوکمی یاسا چیە بڕیارێك دەربارەی پابەندکردن بە پێدانی نەفەقەی هاوسەری (النفقة الزوجیة) لەلایەن دادگای جینایاتەوە دەرچوە؟**

وەڵام: لەبەر ئەوەی دادگای جینایات تایبەتمەند نیە بە دەرکردنی ئەم جۆرە بڕیارە بەڵکو دادگای باری کەسی (محکمة الاحوال الشخصیة) تایبەتمەندە ناکرێ جێبەجێ بکرێ، چونکە یەکێك لە مەرجەکانی جێبەجێکردنی بڕیاری دادگا ئەوەیە کە لە دادگایەکی پسپۆڕەوە دەرچوو بێ.

**٦- نابێ حوکمەکە لەسەر مەرجێکدا هەڵپەسێردرابێ (ان لا یکون الحکم معلقا علی شرط):**

هەڵپەساردن لێرەدا بەو مانایە دێ کە دادگا جێبەجێکردنی حوکمەکە بەبەستێتەوە بە ئەگەری ڕودانی شتێکی تر.

پرسیار: حوکمی یاسا چیه ئەگەر بڕیاری دادگا فەرمان بدا: (ئەگەر قەرزار خانوەکەی خۆی فرۆشت ئەوا دەبێ قەرزەکە بداتەوە)؟

وەڵام: بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ناتوانێ ئەم بڕیارە جێبەجێ بکا چونکە فەرمانەکە حەتمی نیە و بەسەر مەرجێکی داهاتو هەڵپەسێردراوە کە لەوانەیە نەیەتە دی. یەکێك لە مەرجەکانی جێبەجێکردنی بڕیاری دادگا ئەوەیە کە بەسەر هیچ مەرجێکی داهاتو هەڵنەپەسێردرابێ.

### ٧- نابێ جێبەجێکردنی حوکمەکە مەحاڵ بێ:

دەبێ جێبەجێکردنی حوکمەکە لە توانای بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن دا بێ. بۆ نمونە:

ئەگەر دادگا فەرمان بە باوکێك بدا منداڵەکەی ڕادەستی دایکی بکاتەوە بەڵام لە کاتی جێبەجێکردن دەرکەوێ منداڵەکە مردووە ئەوا ئەو فەرمانە لەبەر مەحاڵ بوون ناکرێ جێبەجێ بکرێ.

### ٨ - دەبێ حوکمەکە ناکۆك نەبێ لەگەڵ حوکمێکی دیکەی دادوەری کە پێشتر لە هەمان بابەت و لە نێوان هەمان دوو لایەن دەرچوبێ:

ئەگەر دوو حوکمی ناکۆك هەبوو لەسەر هەمان کێشە ئەوا بەڕیوەبەرایەتی جێبەجێکردن دەتوانێ داوا لە دادگای تەمیز بکا کە بڕیار لە کێشەکە بدا و یەکلای بکاتەوە (م ٢١٧ یاسای مورافەعاتی مەدەنی ساڵی ١٩٦٩).

### ٩- دەبێ حوکمەکە ماوەی بەسەرچون (مدة التقادم) ی ڕەت نەکردبێ:

ئەگەر ماوەی ٧ ساڵ بەسەر بڕیاری دادگا دا بڕوا لەو ڕۆژەوەی کە پلەی بڕاوەی وەرگرتوە و حوکم بۆدراو داوای جێبەجێکردنی نەکرد ئەوا بڕیارەکە توانای جێبەجێکردن لەدەست دەدا (م ١١٤).

هەرچەند بڕیارەکە توانای جێبەجێکردن لەدەست دەدا بەڵام وەك نوسراوێکی ڕەسمی بەهای قانونی هەر دەمێنێ.

بۆ نمونە ئەگەر قەرزارەکە بە ویستی خۆی قەرزەکەی داوە ئەوا بە پێی یاسا وا دادەنرێ کە دیاری داوەتێ بەڵکو قەرزەکەی داوەتەوە.

کە بڕیاری دادگا توانای جێبەجێکردنی لەدەست دا لەبەر تێپەڕبونی ماوەی بەسەرچوون (٧ ساڵ) ئەوا خاوەن قەرز بۆی هەیە ئەگەر پاساوی مەعقولی هەبوو داوا لە دادگای پسپۆڕ بکا بڕیارێك دەربکا بۆ نوێکردنەوەی ماوەی توانای جێبەجێکردن. (بڕیاری دادگای تەمییز لە بەغدا لە بەرواری ٢٠٠٧/١٠/٣٠ دەرچوە).

# جێبەجێکردنی حوکمی دادگا پێش ئەوەی پلەی براوە (بنبر) وەرگرێ

**١.** هەر بڕیارێکی دادگا لە دژی فەرمانگەکانی دەوڵەت دەرچووبێ تا پلەی براوە وەرنەگرێ ناشێ جێبەجێ بکرێ. کە پلەی براوەی وەرگرت ئەوسا خاوەنقەرز دەتوانێ داوای جێبەجێکردنی لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بکا.

**٢.** بەڵام ئەگەر بڕیاری دادگا لە دژی کەسێکی ئاساییەوە دەرچوو بوو، ئەوا هەر لە یەکەم ڕۆژی دەرچونەوە (بۆ نمونە لە دادگای بیدائە) لایەنەکان دەتوانن داوای جێبەجێکردنی لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بکەن (م ٥٣ یەکەم).
بەڵام ئەگەر حوکمدراو (المحكوم عليه) بەڵگەیەکی هێنا کە پێشان بدا **تانەی لە بڕیارەکەی دادگا گرتوە** جا تانەکە بە شێوەی ئیستیئناف بێ، یان ئەگەر حوکمەکە دەربارەی عەقار بو بە تەمیز ، یان نارازیبون لە حوکمی بێئامادەبون (الاعتراض على الحكم الغيابي) ئەوا دەبێ ئیجرائاتی جێبەجێکردنەکە بوەستێندرێ تا بڕیاری یەکلاکەوەوە لە دادگای پسپۆڕ دەردەچێ.

**٣.** چەند جۆرێك لە بڕیاری دادگا هەیە تا بە تەمیز پشتڕاست نەکرێنەوە، بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بۆی نیە ڕێکارەکانی جێبەجێکردن دەست پێ بکا.

# ئەو حوکمانەی کە تەنها دوای پشتڕاستکردنەوەیان بە تەمیز دەشێ جێبەجێ بکرێن

هەندێك حوکم هەیە دادگای بڕیاردەر (بۆ نمونە: دادگای بەرایی واتە بیدائە یان دادگای باری کەسی) دوای ئەوەی دەریدەکا ئەگەر لایەنی پەیوەندیدار خۆیان تەمیزی نەکەنەوە ئەوا دادگایەکە دەبێ خۆی ڕاستەوخۆ بڕیار و دۆسیەکەی بۆ دادگای تەمیز (محكمة التمييز) بنێرێ بۆ وردبوونەوە لێی، بەگوێرەی م ٣٠٩ یاسای مورافەعاتی مەدەنی ساڵی ١٩٦٩. ئەو حوکمانە تا دادگای تەمیز پشتڕاستیان نەکاتەوە ناکرێ جێبەجێ بکرێن ئەمەش بۆ پاراستنی بەرژەوەندی یەکێك لە لایەنەکانە وەك منداڵ و شێت یان لەبەر گرنگی بابەتەکەیە بۆ ئەوەی پەلە نەکرێ لە جێبەجێکردنی.

## حوکمەکان کامانەن؟

١) حوکمی دادگای ئەحوالی شەخسی کە بەتاڵکردنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیری تێدا بێ (الاحكام المتضمنة فسخ عقد الزواج).

٢) یان حوکمێك دژ بە وەزارەتی دارایی.

٣) یان حوکمێك دژ بە ئەوقاف درابێ.

٤) یان حوکمێك دژ بە منداڵ درابێ.

٥) یان حوکمێك دژ بە شێت درابێ.

٦) یان حوکمێك بەشێوەی غیابی درابێ واتە بێ ئامادەبوونی حوکمدراو لە دادگادا حوکم درابێ و حوکم بەسەدادراو تانەی لێ نەگرتبێ بە نارازیبوون لە بریاری غیابی (الاعتراض على الحكم الغيابي).

ئەگەر یەکێك لەو حوکمانە بهێنرێنە بەریوەبەرایەتی جێبەجێکردن دەبێ کۆپیەك لە بریاری پشتراستکردنەوەیان لەلایەن دادگای تەمیزەوە لەگەڵ هاوپێچ بکرێ بۆئەوەی بەریوەبەرایەتی جێبەجێکردن دڵنیا بێ کە شیاوی جێبەجێکردنە.

## بریاری دادوەری خێرا (قرارات القضاء المستعجل)

### بریاری دادوەری خێرا چیە؟

بریارێکی کاتیە کە دادوەر بێ ئەوەی بابەتە بنەرەتیەکە یەکلابکاتەوە لە مەسەلەیەکی خێرا کە ترسی کات بەسەرچونی لیدەکرێ دوای گوێگرتن لە لایەنەکان دەری دەکا.

١) سامانێك (المال) بۆ نمونە تابلۆیەکی هونەری کێشەی مولکایەتی لەسەرە. یەکێك لە لایەنەکان داوا دەکا پاسەوان بۆ سامانەکە دابنرێ نەوەك ئەو کەسەی کە لە ژێردەستی دایە بیفەوتێنێ. دادوەر داوا لە هەردو لایەن دەکا لە دادگا ئامادەبن و گوێ لە هەردو لایەن دەگرێ. ئینجا بریارێکی کاتی دەردەکا بە دانانی پاسەوانێك تابلۆیەکە بپارێزێ تا ئەوکاتەی کێشە بنەرەتیەکە واتە کێشەی مولکایەتی یەکلایی دەکرێتەوە (ليتولى حفظ العين و استغلالها حتى يفصل النزاع على ملكيتهام ٨-١٤٧ قانون المرافعات المدنية احكام الحراسة القضائية. )

٢) مولکدارێك دەیەوێ دیوارێك دروست بکا. دراوسێکەی دەڵێ ئەمە لەسەر زەوی منە. دادوەر دوای گوێگرتن لە هەردولایەن بریارێکی کاتی دەردەکا بە قەدەغە کردنی بنیاتنانی دیوارەکە تا کێشەی مولکایەتی زەوییەکە یەکلا دەبێتەوە.

٣) بریاری خێرا بە قەدەغەکردنی داوالێکراو لە سەفەرکردن: ئەگەر داواکار پیشان بدا کە خەتەرێکی راستەقینە هەیە لەوەی داوالێکراو بەمەبەستی خۆدزینەوە لە داوایەکە سەفەر دەکا (م ١٤٢ یاسای مورافەعاتی مەدەنی ساڵی ١٩٦٩) ئەوا دادوەر دەتوانێ بریارێکی خێرا بەقەدەغەکردنی سەفەری قەرزار دەربکا.

### کێ بریاری دادوەری خێرا جێبەجێ دەکا؟

١) ئەو دادگایەی بریارە خێراکەی دەرکردوە راستەوخۆ جێبەجێی دەکا.

٢) ئەگەر پێویست بکا، دەشێ بەریوەبەرایەتی جێبەجێکردن بریارە خێراکان جێبەجێ بکا (م ١٦٥ یاسای مورافەعاتی مەدەنی).

## بریاری وەلائی

### بریاری وەلائی چیە؟

لە هەندێك مەسەلەی خێرادا دادوەر دەسەڵاتی تەقدیری هەیە بەپشتبەستن بە عەریزەی لایەنێك و بەڵگە هاوپێچەکانی (المستندات المرفقة) پێش گوێگرتن لە لایەنەکەی دی بریاری وەلائی دەربکا کە فەرمانێکی کاتیە تا مەسەلە بنەرەتیەکە یەکلا دەکرێتەوە (م ١٥١ یاسای مورافەعاتی مەدەنی).

ئیجرائاتی بڕیاری وەلاتی زۆر ئاسان و خێراو کەم-مەسرەفە.
بڕیاری وەلاتی دەشێ لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن جێبەجێ بکرێ.
نمونە:
دادوەر لەسەر زانیاری ناو عەریزەیەك فەرمان دەردەکا بە دانی نەفەقە بەشێوەیەکی کاتی لەلایەن پیاوەوە تاوەکو مەسەلەکە یەکلا دەکرێتەوە (یاسای ئەحوالی شەخسی ساڵی ١٩٥٩).
فەرمانی دادوەر بە دانانی دایەن بۆ منداڵێك کە تازە دایکی مردوە و باوکی شایستە نیە مافی دایەنیکردنی بدرێتێ (یاسای ئەحوالی شەخسی ١٩٥٩).

## بڕیاری حەکەم :

هەندێك جار وا ڕێکدەکەوێ کە دوو لایەن کێشەیەکیان هەیە بە ڕێککەوتنی هەردوولایان یان بە بڕیاری دادگا کەسێك بە حەکەم دادەنێن، تا لە دەرەوەی دادگا خەتێکیان بە نێواندا بهێنێ کێشەکەیان یەکلا بکاتەوە. وەك ڕێسایەکی گشتی ئەو بڕیارەی کە حەکەمەکە دەری دەکا شیاوی جێبەجێکردن نیە لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن.
بڕیاری حەکەم تەنها ئەو کاتە شیاوی جێبەجێکردنە ئەگەر:
١) دادگای پسپۆڕ بە بڕیارێك بڕیاری حەکەم بکا پەسند بکا
٢) دەبێ ناوەرۆکی بڕیاری حەکەم دژی نیزام و ئادابی گشتی نەبێت.
(م ٢٧٢ لە یاسای مورافەعات)

## دووەم: جێبەجێکردنی بڕیاری دادگای بیانی

مادە ١٢ لە یاسای جێبەجێکردن ڕێگەی داوە بڕیاری دادگای بیانی لە عێراقدا جێبەجێ بکرێ بەگوێرەی حوکمەکانی:
١. یاسای جێبەجێکردنی بڕیاری دادگای بیانی لە عێراق ژمارە ٣٠ ساڵی ١٩٢٨ - قانون تنفیذ احکام المحاكم الاجنبیة في العراق رقم ٣٠ لسنة ١٩٢٨.
٢. پەیماننامە نێودەوڵەتیەکانی نێوان عێراق و وڵاتانی تر.
بۆ ئەوەی بڕیاری دادگای بیانی لە عێراق جێبەجێ بکرێ دەبێ حوکم بۆدراو بڕیارێك لە دادگایەکی عێراق بەدەستبهێنێ کە ڕێگا بدا بڕیارە بیانیەکە لە عێراق جێبەجێ بکرێ. بڕیاری دادگا عێراقییەکە پێی دەگوترێ **بڕیاری جێبەجێکردن (قرار التنفیذ)**.

## کام جۆر لە بڕیاری دادگای بیانی لە عێراق جێبەجێ دەکرێ؟

بەگوێرەی ئەو پەیماننامانەی عێراق لەگەڵ دەوڵەتە بیانیە عارەبیەکان ئیمزای کردوە دەشێ بڕیاری دادگای دەوڵەتانی عارەب لە کەیسی مەدەنی و بازرگانی و باری کەسی (الاحوال الشخصیة) لە عێراقدا جێبەجێ بکرێ.
ئەو پەیماننامانەی لەگەڵ دەوڵەتە بیانیە غەیری عارەبیەکان ئیمزا کراوە تەنها ڕێگە بە جێبەجێکردنی بڕیاری مەدەنی و بازرگانی لە عێراقدا دەدا. ڕێگا بە جێبەجێکردنی بڕیاری دادگای ئەحوالی شەخسی نادا.

**نموونە:**

- بڕیاری ڕادەستکردنەوەی منداڵێك لە باوکەوە بۆ دایکی ئەگەر لە دادگایەکی بەریتانی (بیانی غەیرەعارەبی) دەرچووبێ لە عێراق جێبەجێ ناکرێ.
- بەڵام ئەگەر لە دادگایەکی لوبنانی (بیانی عارەبی) دەرچووبێ لە عێراق جێبەجێ دەکرێ.

## مەرجەکانی جێبەجێکردنی بڕیاری دادگای بیانی لە عێراق

یاسای جێبەجێکردنی بڕیاری دادگای بیانی لە عێراق ژمارە ٣٠ ساڵی ١٩٢٨، مادە ٦ ئەم **مەرجانەی** داناوە جێبەجێکردنی بڕیاری دادگای بیانی لە عێراق:

١- دادگا بیانیەکە پێڕاگەیاندنی گونجاو و کافی بۆ حوکم بەسەرداردراو دەرکردبێ.

٢- دەبێ دادگا بیانیەکە و بەگوێرەی یاسای وڵاتەکە پێکهاتبێ و پسپۆڕ بێ لە دەرکردنی ئەم جۆرە بڕیارە.

٣- دەبێ بڕیارەکە پەیوەندی بە قەرز، پارە یان قەرەبوی مەدەنیەوە هەبێ.

٤- دەبێ بڕیارەکە دژ بە **نیزامی گشتی** (النظام العام Public Order) لە عێراق نەبێ .

٥- دەبێ بڕیارەکە هێزی جێبەجێکردنی هەبێ لە وڵاتە بیانیەکە خۆیدا.

٦- ئەو دادگا عێراقیەی داوای لێکراوە کە (بڕیاری جێبەجێکردن) دەربکا، دەبێ ڕەچاوی بوونی هەموو ئەم مەرجانەی سەرەوە بکا، تەنانەت ئەگەر حوکم لەدژدراو داواشی نەکردبێ.

## سێیەم: ئەو نوسراوانەی دەشێ جێبەجێ بکرێن (المحررات القابلة للتنفيذ)

جگە لە بڕیاری دادگا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن هەندێك نوسراو جێبەجێ دەکا کە یاسا جۆری ئەو نوسراوانە ومەرجەکانی جێبەجێکردنیانی دیاری کردوە. بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن دەتوانێ ماف بەگوێرەی ئەو نوسراوانە بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە بێ ئەوەی پێویست بە بڕیاری دادگا بکا کە ئەمەش کات و ئەرك و مەسرەف پاشەکەوت دەکا.

### مەرجەکانی ماف:

یاسای جێبەجێکردن چەند مەرجێکی داناوە کە دەبێ لە مافداهەبێت بۆ ئەوەی نوسراوەکە جێبەجێ بکرێ (م ١٣):

**١- مافەکە دەبێ زانراو بێ:**

دەبێ مافەکە ئاشکرا بێ و بە وردی لەسەر بناخەی کێش، قەبارە، بڕ، جۆر یان ژمارە، جا بەپێی سروشتی مافەکە، دیاریکرابێ. بۆ نمونە: ١٠٠٠٠ دیناری عێراق.

ئەگەر مافەکە دیارینەکرابێ، بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ناتوانێ نوسراوەکە جێبەجێ بکا.

### ٢- دەبێ مافەکە کاتی دانی هاتبێ و بەمەرجدا هەڵنەپەسێردرابێ (ان يكون الحق مستحق الاداء وغير معلق على شرط):

نمونە: ئەگەر کومپیالەیەك بلێ لە ٢٠١٢/١٢/٦ مەبلەغی 1000$ بدرێ بە سودمەند، ئەوا ناکری بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن نوسراوەکە پێش وادەی خۆی واتە بەر لە ٢٠١٢/١٢/٦ جێبەجێ بکا.

نابێ مافەکە لەسەر مەرجێك هەڵپەسێردرابێ، ئەگەر بە مەرج هەڵپەسێردرا بو ئەوا حوکە یاساییەکەی ئەوەیە نوسراوەکە جێبەجێ ناکرێ.

### ٣- دەبێ مافەکە دژ بە نیزامی گشتی و ئاداب نەبێ (يجب ان يكون الحق غير مخالف للنظام العام او الآداب):

دەبێ بابەتی مافەکە لە یاسا قەدەغە نەبێ و دژ بە نیزام و ئادابی گشتی نەبێ.

نمونە: ئەم دو قەرزە دژ بە نیزامی گشتیین نابێ جێبەجێ بکرێن:

١) ڕێککەوتنی فەرمانبەر بە وەرگرتنی مەبلەغێك پارە بەرامبەر ڕاییکردنی موعامەلەیەك. چونکە ئەمە دژی یاسایە و تاوانی بەرتیلە.

٢) قەرزێك کە لە ئەنجامی دۆڕان لە قومار دروست دەبێ، چونکە دژی نیزامی گشتییە.

ڕێساکانی نیزامی گشتی پەیوەندیدارە بەرژەوەندیە باڵا کۆمەڵایەتی و ئابوری و ڕامیاریەکانی کومەڵگا کە لە سەروی بەرژەوەندی تاکەکەسیە و ناکرێ ڕێککەوتن لەسەر پێچەوانەیان بکرێ.

### ٤- نابێ قەرزار لە دەرەوەی عێراق بێ یان جێگەی دیار نەبێ یان مردو بێ:

ئەم مەرجە مافی هەندێك جۆر لە قەرزار دەپارێزێ وەك ئەو قەرزارە ی کە لە هەندەرانە. هەروەها بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن لە هەندێك کێشە دوردەخاتەوە وەك ئەوەی ئیجرائاتی جێبەجێکردن لە دژی کەسێك بکا جێگەی دیار نەبێ.

ئەم مەرجە لە ١٩٩٨ دانرا، بەڵام پێشتر لە یاسای جێبەجێکردنی ساڵی ١٩٥٧ دا هەبو.

## جۆرەکانی ئەو نوسراوانەی دەشێ جێبەجێ بکرێن

### چ جۆرە نوسراوێك دەشێ جێبەجێ بکرێ؟

یاسای جێبەجێکردن لە م ١٤ جۆرەکانی ئەو نوسراوانەی کە دەشێ جێبەجێ بکرێن کە پێیان دەگوترێ "نوسراوی جێبەجێکردن – المحررات التنفيذية" دەستنیشان کردوە کە ئەمانەن:

### ١- ئەو پەڕاوی بازرگانیانەی توانای دەستاودەست کردنیان هەیە (م ١٤، أ)

ئەمانەی خوارەوە گرنگترین خاسیەتەکانی پەڕاوی بازرگانین:

١) لەبەر ئەوەی دەرکردنی پەڕاوی بازرگانی کردارێکی یاساییە (تصرف قانوني) دەبێ **مەرجە بابەتیەکانی** (الشروط الموضوعية) تێدا بێ کە ئەمانەن:

ئەهلییە (الاهلیة)، ڕەزامەندی (الرضا) ، بابەت (المحل) ، هۆ (السبب).

٢) پەڕاوی بازرگانی دەبێ **مەرجە شێوەکیەکانی** (الشروط الشکلیة) تێدا بێ کە گرنگترینیان ئەوەیە نوسراو بێ و فەرمان یان پەیماندان یان دانپێدانانی تێدا بێت، یاسای بازرگانی مەرجە شێوەکیەکانی بۆ هەر پەڕاوێك بە جیا دیاریکردوە وەك ناوی پەیماندەر لە کۆمپیالە.

٣) کەفیل لە پەڕاوی بازرگانیدا بەپێی یاسا بە زامنکار دادەنرێ (یعتبر الکفیل متضامنا بموجب القانون) هەتا ئەگەر لە پەڕاوە بازرگانیەکە باسی نەکرابێ (م 14 دووەم).

بۆیە دەشێ جێبەجێکردن لە دژی کەفیل بکرێ بەڵام دەبێ قەرزارەکە ئاگادار بکرێتەوە نەوەك نارەزایی هەبێ کە دەبێ لە ماوەی 7 ڕۆژدا بیگرێ.

## جۆرەکانی پەڕاوی بازرگانی:

سێ جۆر پەڕاوی بازرگانی هەیە کە توانای دەستاودەستکردنیان هەیە: کۆمپیالە، سەفتەجە و چەك.

### ١) کۆمپیالە (کمبیالة – سند لامر):

نوسراوێکە لەو شێوەیەدایە کە یاسا داوای کردوە کە تێیدا کەسێك (پەیماندەر - المتعهد ) پەیمان دەدا پابەند دەبێ بەپێی نوسراوەکە مەبلەغێکی دیاریکراو لە پارە لە کات و شوێنێکی دیاریکراو بدا بە کەسێکی دی (سودمەند - المستفید). (م 133 یاسای بازرگانی ژمارە 30 ساڵی 1984).

### ٢) سەفتەجە (السفتجة او الحوالة التجاریة):

نوسراوێکە لەو شێوەیەدایە کە یاسا داوای کردوە کە تێیدا کەسێك (ڕاکێشەر - الساحب) فەرمان بە کەسێکی دی (لێراکێشراو - المسحوب علیه) دەدا مەبلەغێك پارە لە کات و شوێنێکی دیاریکراو بدا بە کەسێکی دی (سودمەند - المستفید)، (م 40 یاسای بازرگانی ژمارە 30 ساڵی 1984).

### ٣) چەك ( cheque - الصك – الشیك):

نوسراوێکە لەو شێوەیەدایە کە یاسا داوای کردوە کە تێیدا کەسێك (ڕاکێشەر - الساحب) فەرمان بە بانکێك دەدا مەبلەغێك پارە لە کاتی پێشکەشکردنی نوسراوەکە بدا بە کەسێکی دی (سودمەند - المستفید) یان بە فەرمانی ئەو یان بۆ هەڵگر. (م 138 یاسای بازرگانی ژمارە 30 ساڵی 1984)

## ٢. ئەو سەنەدانەی کە دانانن بە قەرزیان تێدایە (م ١٤، ب) (السندات المتضمنة اقرارا بدین):

سەنەدێکە تێیدا ئەو کەسەی واژۆی کردوە دان دەنێ بە پابەندبونی خۆی بە دانی مەبلەغێك پارە یا کاڵایەك بە کەسێکی دی.
ئەم جۆرە سەنەدە ئەم خاسیەتانەی هەیە:

١) مەرج نیە لە شێوەیەکی دیاریکراودا بێ (لا تتسم بالشکلیة). دەشێ بۆ نمونە لە نامەیەکدا هاتبێ.

٢) ئەگەر نوسەرەکە (ئەوەی سەنەدەکەی ئیمزا کردوە) کەفیلی نازامنکار بێ ئەوا سەنەدەکە لە دژی جێبەجێ ناکری تەنها لەو حاڵەتە نەبێ کە سامانی قەرزارە ئەسڵیەکە کافی نەبێ بۆ داناوەی قەرزەکە (م ١٠٢١ یاسای مەدەنی).

٣) ئەگەر نوسەرەکە (ئەوەی سەنەدەکەی ئیمزا کردوە) کەفیلی زامنکار بێ خاوەنقەرز دەتوانێ داوای جێبەجێکردنی سەنەدەکە لە دژی کەفیلی زامنکار یا قەرزارە ئەسڵیەکە بکا (م ١٠٣١ یاسای مەدەنی).

## ٣. ئەو سەنەدانەی کە ئیسپاتی مافی شەخسی دەکەن (م ١٤، د)
## (السندات المثبتة لحق شخصي)

مافی شەخسی پەیوەندیەکی یاساییە لە نێوان دو کەس قەرزار و خاوەنقەرز، کە بەگوێرەی مافەکە خاوەنقەرز دەتوانێ داوا لە قەرزار بکا مافێکی عەینی بۆ بگوازێتەوە یان کارێك بکا یان کارێك نەکا.

ئەو پەیوەندیە سەبارەت بە قەرزار پابەندبونە و سەبارەت بە خاوەنقەرز مافە کەواتە پابەند بون و ماف و دوروی یەك پەیوەندین.

گرێبەستی هاوسەرگیری سەنەدێکە ئیسپاتی مافی شەخسی دەکا لەروی مارەیی پاشەکی (المهر المؤجل).

## ٤. ئەو سەنەدانەی کە ئیسپاتی مافی عەینی دەکەن و لەو شێوەیەدان کە یاسا داوای کردوە (م ١٤، ج):
## (السندات المثبتة لحق عيني استوفت الشكل الذي نص القانون عليه)

مافی عەینی دەسەڵاتێکی ڕاستەوخۆیە لەسەر شتێکی دیاریکراو کە یاسا بە کەسێکی دەبەخشێ.

ئەگەر مافی عەینی پەیوەندی بە عەقارەوە هەبو ئەوا دەبێ هەر تەسەروفکردنێکی یاسایی بە عەقارەکە لە فەرمانگەی تۆماری عەقاری تۆمار بکرێ.

مافی مولکداریێتی و مافی تەسەروفکردن مافی عەینین.

## ٥- کەفالەی بەردەم جێبەجێکاری داد (م ١٤، هـ):
## (الكفالة امام المنفذ العدل)

بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بۆی هەیە ڕازی بێ کە قەرزار قەرزەکەی بە قست بداتەوە بەو مەرجەی کەفیلێك بێنێ کەفالەتی بۆ بکا کە قستەکان لە وادەی خۆیان دەدا.

کەفالەتەکە دەبێ لەلایەن جێبەجێکاری دادەوە پشتڕاست بکرێتەوە.

ئەم کەفالەیە نوسراوێکە دەشێ بەسەر کەفیل دا جێبەجێ بکرێ بۆ سەندنەوەی باقی قەرزەکە.

### ٦ - بەلگەنامەی تۆماری عەقاری هی باقی ئەو قەرزەی دوای فرۆشتنی عەقاری ڕەهنکراو دەمێنێتەوە:
### (وثيقة التسجيل العقاري لما تبقى من الدين بعد بيع العقار المرهون)

ئەگەر عەقاری ڕەهنکراو بە نرخێك فرۆشرا کە کافی نەبێ بۆ دانەوەی قەرزەکە و مەسرەفی، بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بەلگەنامەیەك دەداتە خاوەنقەرز کە مەبلەغی باقی قەرزەکەی تێدا دیار دەکا. . (م ١٤، و).

ئەم بەلگەنامەیە دەشێ لای بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن جێبەجێ بکرێ بێ ئەوەی پێویست بە فەرمانی دادگا بکا.

### ٧. حوجەت و بڕیار و فەرمانانەی کە یاساییێك هێزی جێبەجێکردنی داوەتێ:
### (الحجج والقرارات والاوامر التي لها قوة التنفيذ)

هەر حوجەت و بڕیار و فەرمانێك دەگرێتەوە کە دەقی یاسایەك ڕێگەی بە جێبەجێکردنی داوە (م ١٤، ز)
داواکاری جێبەجێکردن دەبێ ئەو یاسایە دەسنیشان بکا کە ڕێگەی بە جێبەجێکردنی سەنەدەکە داوە.

نموونە:

گرێبەستی هاوسەرگیری سەبارەت بە مارەیی دواخراوەوە (المهر المؤجل) حوجەتێکە توانای جێبەجێکردنی هەیە.
فەرمانی خێرای نەفەقە کە لەلایەن دادگای باری کەسیەوە دەردەچێ بڕیارێکە توانای جێبەجێکردنی هەیە.

## ڕێکارەکانی جێبەجێکردن

١. جێبەجێکردنی خۆویستانە (التنفيذ الطوعي).
٢. جێبەجێکردنی ئارەزومەندانە (التنفيذ الرضائي).
٣. جێبەجێکردنی بەزۆر (التنفيذ الجبري).

## ١- جێبەجێکردنی خۆویستانە

ڕێگـای ئاسـایی و سروشـتی ئەوەیە کە قەرزار لە کاتی خۆیـدا و بە ویـستی خـۆی پابەنـدبونەکەی بەجـێ بـگەیەنێ واتە قەرزەکەی بداتەوە. ئەم جۆرە جێبەجێکردنە هیچ پەیوەنـدی بە بەڕێـوەبەرایەتی جێبەجێکـردنەوە نیە چـونکە پێش ئەوەی کار بگاتە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن قەرزار ئەستۆی خۆی لە پابەندبوونەکە پاك کردۆتەوە.

ئەگەر قەرزار خۆویستانە پابەندبونەکەی بەجێ نەگەیاند و خاوەنقەرز داوای لە بەڕێـوەبەرایەتی جێبەجێکـردن کە مـافەکەی بۆ بسەنێتەوە ئەوا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بەگوێرەی یاسا دەست بە ڕێکارەکانی جێبەجێکردن دەکا.

## ٢- جێبەجێکردنی ئارەزومەندانە

بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکـردن نامەی پێڕاگەیانـدن بـۆ قەرزار دەنێرێ و داوای لـێ دەکا قەرزەکە لە مـاوەیەکی دیاری کراودا ئارەزومەنـدانە بـداتەوە. مـاوەی دیاریکـراو بە پـێی یاسـا ( ٧ ) ڕۆژە بـۆ قەرزاری ئاسـایی و (٣٠) ڕۆژە ئەگەر قەرزارەکە فەرمـانگەیەکی دەوڵەت بـوو (١٥) ڕۆژە ئەگەر قەرزار شـوێنی دانیـشتنی دیار نەبێ. مـاوەکە لە ڕۆژی دوای پێڕاگەیانـدنەوە دەستپێدەکا (م ١٨ و م ٢٠).

وەك هانـدانێك بـۆ جێبەجێکـردنی ئارەزومەنـدانە ئەگەر قەرزار لەو مـاوەیەدا قەرزەکەی بـداتەوە ئەوا لە دانی ڕسـوماتی دادوەری دەبەخشرێ.

## ٣- جێبەجێکردنی بەزۆر

ئەگەر قەرزار بە ڕەزامەندی خۆی قەرزەکەی نەداتەوە لەو ماوەیەی بۆی دیاریکراوە دوای پێڕاگەیاندنی جێبەجێکـردن یان ئەگەر نارەزایی نەگرێ ئەوا دەسەڵاتی گشتی کە دەکا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن مافەکە بەزۆر لە قەرزار دەسەنێ و دەیدا بە خاوەنقەرز.

## کاتی ئەنجامدانی ڕێکارەکانی جێبەجێکردن:

نابێ ئیجرائـاتەکانی جێبەجێکـردن لە نێـوان سـەعات ٩ ی شـەو تا ٦ ی بەیانیـدا بکـرێ یان لە ڕۆژانی جەژن و پشودا بکرێ.

بەڵام ئەم ڕێسایە ئیسـتیسـنای هەیە:

جێبەجێکـردن لە نێـوان سـەعات ٩ ی شـەو تا ٦ ی بەیانیـدا تەنهـا لە حـاڵەتی زەرورەت دەکرێ، دەبێ جێبەجێکاری داد بڕیاری تایبەتی بۆ دەربکات (م ٢٣).

## گواستنەوەی دۆسیەی جێبەجێکردن:

دەشێ دۆسیەی جێبەجێکردن لە بەڕێوەبەرایەتیەکی جێبەجێکردنەوە بگوازرێتەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتیەکی دیکەی جێبەجێکردن لەسەر داوای خاوەنقەرز، قەرزار یان بە بڕیاری جێبەجێکاری داد.

هیچ دەقێکی یاسایی نیە ڕێگا بگرێ لە گواستنەوەی دۆسیەی جێبەجێکردن .

هەندێك جار بەرژەوەندی گشتی وا پێویست دەکا دۆسیەکە بگوازرێتەوە بۆ نمونە ئەگەر جێبەجێکاری داد خزمی نزیکی لایەنێکیان بێ.

دەکرێ بڕیارەکەی جێبەجێکاری داد بە گواستنەوەی دۆسیە تانەی لێ بگیرێ بە تەزەلوم (تظلم) یان تەمیز لە دادگای ئیستیئناف بە سیفەتی تەمیزی (محكمة الاستئناف بصفتها التمييزية).

## جێگرتنەوە (الانابة):

دەشێ بەڕێوەبەرایەتیەکی جێبەجێکردن بۆ نمونە (سلێمانی) داوا لە بەڕێوەبەرایەتەکی دیکەی جێبەجێکردن بۆ نمونە (هەولێر) بکا کە لەجیاتی ئەو هەندێك ئیجرائاتی جێبەجێکردن ئەنجام بدا کە لەبەر هەر هۆیەك بێ وا پێویست دەکا ئیجرائاتەکە لەدەرەوەی ناوچەی جوگرافیای خۆی بکرێ. وەك ئەوەی دۆسیەی جێبەجێکردن لە سلێمانی کراوەتەوە بەڵام دەردەکەوێ کە قەرزار عەقارێکی لە هەولێر هەیە. دۆسیەکە هەر لە (بەڕێوەبەرایەتی جێگیراوە) - (المديرية المنيبة) دەمێنێتەوە و بەڕێوەبەرایەتی جێگرەوە (المديرية المنابة) تەنها ئەو کارە لە دۆسیەکە دەکا کە پێی سپێردراوە.

هەر کارێکی بەڕێوەبەرایەتی جێگرەوە (المديرية المنابة) لە دۆسیەکە دەیکا، بەڕێوەبەرایەتی جێگیراو (المديرية المنيبة) لێی بەرپرسیارە.

## یەکخستنی دوو دۆسیەی جێبەجێکردن:

دەشێ دوو دۆسیەی جێبەجێکردن یان زیاتر لە دژی قەرزارێك یەکبخرێن، بۆ نمونە قەرزارێك دۆسیەی نەفەقەی هاوسەرگیری و دۆسیەی نەفەقەی منداڵان و دۆسیەی مارەیی پاشەکی هەیە دەشێ هەرسێ دۆسیەکە لە یەك دۆسیەدا یەکبخرێن.

ئەمە لە یاسای جێبەجێکردن باس نەکراوە بەڵام بەپێی ڕێسا گشتیە یاساییەکان کاری پێ دەکرێ بۆ ئەوەی پشێوی لە کاری جێبەجێکردن دروست نەبێ و کارەکان بە نەرمونیانی بەڕێوە بچن.

ئەم دۆسیەیەی یەکەمجار کراوەتەوە دۆسیەکانی تری دەخرێنە سەری، بەگوێرەی ڕێسای الاسبقية.

### نەبونی تایبەتمەندی شوێنەکی:

داواکاری جێبەجێکردن دەتوانێ موراجەعەی هەر بەڕێوەبەرایەتیەکی جێبەجێکردن بکا بێ خۆ بەستانەوە بە تایبەتمەندی شوێنەکی (م ٢٤).

بۆ نمونە ئازاد خەلکی شەقلاوەیە، قەرزی لەسەر نەوزادە کە خەلکی هەولێرە.

ئازاد دەتوانێ داوای جێبەجێکردن لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردنی شەقڵاوە یان هەولێر یان هەر بەڕێوەبەرایەتیەکی دیکەی جێبەجێکردن لە هەرێم پێشکەش بکا.

### نامە ناردن و موخاتەبەی بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن:

مادەی (٢١) ڕێگای بە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن داوە کە بێ ڕەچاوکردنی زنجیرەی فەرمان و موراجەعە (سلسلة الاوامر و المراجعات)، کە لە گفتوگۆ و نامەگۆڕینەوەی ڕەسمیدا پەیڕەو دەکرێ، پەیوەندی ڕاسەوخۆ بە گشت وەزارەت و فەرمانگەکان بکا سەبارەت بەو کاروبارانەی پەیوەندی بە جێبەجێکردنەوە هەیە.

فەرمانبەری تایبەتمەنـد لەو وەزارەت و فەرمانگـایانە بەرپرسـیارە لە ئەنجامـدانی فەرمـان و بـڕیارەکانی بەڕێـوەبەرایەتی جێبەجێکردن.

ئەگەر فەرمانبەرەکە بڕیارەکانی بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردنی جێبەجێ نەکرد ئەوا بەپێـی مادەی (٢٤٢) لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە (١١١) ساڵی ١٩٦٩ بەرپرسیار دەبێ سزاکەی حەپسکردنە کە لە (٦) مانگ زیاتر نەبێ لەگەڵ/یان غەرامە.

## دەسپێکردنی ڕێکارەکانی جێبەجێکردن

### ڕێکارەکانی جێبەجێکردن بە چی دەست پێدەکا؟

ڕێکارەکانی جێبەجێکردن بەوە دەسـت پێدەکا کە یەکێك لە لایەنەکان (زۆربەی جار خاوەنقەرزە) دەڕواتە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن و داوا دەکا کە سـەنەدێکی جێبەجێکـردن جا بڕیاری دادگا بێ یان هەر نوسراوێك کە شـیاوی جێبەجێکردن بێت بۆی جێبەجێ بکا.

### ئایا داواکردن مەرجە بە عەریزە بێ؟

نەخێر مەرج نـیە داواکار عەریـزە پێـشکەش بـکا، بەڵکـو دەبێ لایەنەکە خـۆی (یان وەکیلی) ئامادە بێ لە بەڕێـوەبەرایەتی جێبەجێکردن و سەنەدی جێبەجێکردنەکەی پێشکەش بکا و ئینجا واژۆ لەسەر ئەو مەحزەرە (ئیستیمارەیە) بکا کە فەرمانبەری پسپۆڕ بۆی دەکاتەوە (م 24).

### ئایا دەشێ بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن لەخۆیەوە بێ داواکاری لایەنەکان دەست بە جێبەجێکردن بکا؟

نەخێر، بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ناتوانێ لەخۆیەوە بێ داواکاری لایەنەکان دەسـت بە جێبەجێکـردن بـکا، ئەگەر وا بـکا ئەوا هەمو ڕێکارەکانی بەتاڵ و نایاسایی دادەنرێن لەبەر دوو هۆ:

١- دەزگاکانی دادوەری و داد دەبێ بێلایەن بن و نابێ لەجیاتی هیچ لایەنێك دەسپێشخەری بکەن.

٢- کەسەکان واتە لایەنەکانی مامەڵەیەك (بۆ نمونە خاوەنقەرز و قەرزار) ئازادن کە چۆن تەسەروف بە مافەکانی خۆیانەوە **دەکەن** و لەوانەیە کە زۆرجاریش وادەبێ بۆخۆیان ڕێکدەکەون بێ ئەوەی پەنا بۆ بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ببەن وە پابەندبونەکانیان خۆویستانە جێبەجێ دەکەن.

## شوێنەوارە یاساییەکانی پێشکەشکردنی داوای جێبەجێکردن:

هەر کە داواکاری جێبەجێکردن بە شێوەیەکی دروست داوای جێبەجێکردن پێشکەش بە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن دەکا چەند شوێنەوارێکی یاسایی دروست دەبێ کە ئەمانەن:

١) بڕینی تەقادوم، واتا **ڕاوەستانی تێپەڕبوونی کات** (قطع التقادم).

٢) دەسپێکردنی سووی موستەحەق (سريان استحقاق الفوائد).

٣) پابەندکردنی بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن کە دەست بە ڕێکارەکانی جێبەجێکردن بکا.

## ڕێکارەکانی جێبەجێکردن دوای وەرگرتنی داوای جێبەجێکردن:

ئەو ڕێکارانە چین دەبێ بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ئەنجامیان دا دوای ئەوەی داوا لە داواکار وەردەگرێ؟

١- ئەگەر بەڵگەنامەکە یەکێك بوو لەو سەنەدانەی توانای جێبەجێکردنیان هەیە ئەوا جێبەجێکاری داد سەنەدەکە ڕەوانەی هۆبەی تۆمار دەکا (م 15).

٢- هۆبەی تۆمار وەسفی سەنەدی جێبەجێکردنەکە لە تۆماری بنچینە (سجل الاساس) تۆمار دەکا و بەگوێرەی زنجیرەی ئەو ژمارەیەی لە تۆمارەکە گەیشتوەتێ ژمارەیەکی دەداتێ (م 15).

٣- سەنەدەکە ئینجا لەگەڵ پسولەی سەندنی ڕسوومات بۆ جێبەجێکاری داد دەگەڕێنرێتەوە بۆ ئەوەی وردبینی لە سەنەدەکە بکا و بڕیاری پەسەندکردنی یان ڕەت کردنەوەی بدا.

## جێبەجێکاری داد وردبینی لە سەنەدی جێبەجێکردنەکە دەکا بۆ ئەوەی دڵنیا بێ کە:

١) سەنەدەکە یەکێکە لەو سەنەدانەی کە یاسای جێبەجێکردن ڕێگەی بە جێبەجێکردنیان داوە.

٢) مافەکەی بابەتی سەنەدەکە هەموو مەرجە یاساییەکانی تێدایە.

٣) ئایە داواکاری جێبەجێکردن خاوەن بەرژەوەندیە لە داواکردنەکەیدا.

ئینجا بەرەچاوکردنی ئەو مەرجانەی سەرەوە جێبەجێکاری داد بڕیارێکی لە بەرامبەردا دەردەکا یان داوایەکە **پەسند دەکا** واتە ڕازی دەبێ دەست بە جێبەجێکردنی بکا، یان **ڕەتی دەکاتەوە**.

## ئەگەر جێبەجێکاری داد داوای جێبەجێکردنی ڕەت کردەوە:

ئەگەر جێبەجێکاری داد گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە داوای جێبەجێکردن مەرجە یاساییەکانی تێدا نیە ئەوا:
١) بڕیاری ڕەت کردنەوەی داوایەکە دەدا.
٢) دەبێ هۆکانی ڕەت کردنەوە بنوسێتەوە.
٣) لەگەڵ بڕیاری ڕەت کردنەوە ئەوا سەنەدەکە بۆ داواکاری جێبەجێکار دەگەڕێنێتەوە.

## ئەگەر جێبەجێکاری داد داوای جێبەجێکردنی پەسند کرد:

ئەگەر جێبەجێکاری داد گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە داوای جێبەجێکردن مەرجە یاساییەکانی تێدایە ئەوا:
١) جێبەجێکاری داد پەراوێزێك لەسەر داوایەکە دەنوسێ داوا لە هۆبەی تۆمار دەکا کاری پێویست بکەن و ڕەوانەی هۆبەی تۆماری دەکا.
٢) هۆبەی تۆمار دۆسیەی جێبەجێکردن و کارتی ژمێریاری بۆ دەکەنەوە.
٣) ئینجا فەرمانبەری پسپۆڕ مەحزەرێك دەکاتەوە کە ئیستیمارەیەکە هەموو زانیاریە پێویستەکان دەربارەی داواکاری جێبەجێکردن (طالب التنفيذ) و ئەو کەسەی جێبەجێکردن لە دژی دەکرێ (المطلوب التنفيذ ضده–يان- المنفذ عليه) وە سەنەدی جێبەجێکردنەکە لەخۆ دەگرێ.
٤) دەبێ داواکاری جێبەجێکردن و فەرمانبەرەکە واژۆ لەسەر مەحزەرەکە بکەن.
٥) مەحزەرەکە لە دۆسیەی جێبەجێکردن هەڵدەگیرێ.
٦) دەبێ پێڕاگەیاندنی جێبەجێکردن (مذكرة الاخبار بالتنفيذ) بۆ قەرزار بنێردرێ (م 25).

## ئایا دەشێ تانە لە بڕیاری جێبەجێکاری داد بگیرێ؟

بەڵێ هەر یەکێك لە لایەنەکان بۆیان هەیە تانە لە بڕیارەکانی جێبەجێکاری داد بگرن بە یەکێك لەم دوو ڕێگایە:
١) بە **تەزەڵوم** (التظلم) لای جێبەجێکاری داد خۆی لە ماوەی (٣) سێ ڕۆژ لە ڕۆژی دوای دەرچوونی بڕیارەکە کە دەبێ جێبەجێکاری داد لە ماوەی (٣) سێ ڕۆژ وەڵام بداتەوە بە پشتڕاستکردنەوەی یان هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکەی خۆی کە تانەی لێ گیراوە. یان
٢) بە **تەمیز** لای دادگای **تێهەڵوونەوە** (استئناف) بە سیفەتی **پێداچوونەوەی** (تەمیزی) لە ماوەی (٧) حەوت ڕۆژ لە ڕۆژی دوای دەرچوونی بڕیارەکە.

## دوای پێڕاگەیاندنی قەرزار:

## ڕێکارەکانی جێبەجێکردنی ئارەزومەندانە:

قەرزار دوای ئەوەی پێڕاگەیاندنی بەدەست دەگات ئەگەر کەسێکی ئاسایی بوو و شوێنی گوزەرانی هەمیشەیی یان کاتی دیار بوو یان شوێنی هەڵبژاردەی بۆ پێڕاگەیاندن هەبوو ئەوا دەبێ لە ماوەی 7 ڕۆژ لە ڕۆژی دوای پێڕاگەیاندنەوە لە بەڕیوەبەرایەتی جێبەجێکردن ئامادە بێ (م 18).

ئەگەر شوێنی گوزەرانی هەمیشەیی یان کاتی دیار نەبوو وە شوێنی هەڵبژاردەی بۆ پێڕاگەیاندن نەبوو ئەوا دەبێ لە ماوەی 15ڕۆژ لە بلاوکردنەوەی پێڕاگەیاندنەکە لە دوو ڕۆژنامەی ناوخۆدا لە بەڕیوەبەرایەتی جێبەجێکردن ئامادە بێ (م 27).

ئەگەر وەزارەت یان فەرمانگەیەکی دەوڵەت بێ ئەوا دەبێ نوێنەریان لە ماوەی 30 ڕۆژ لە ڕۆژی دوای پێڕاگەیاندنەوە لە بەڕیوەبەرایەتی جێبەجێکردن ئامادە بێ (م 20 ).

ئەگەر لەماوەی دیاریکراو دا (7 ڕۆژ بۆ خەڵك و 30 ڕۆژ بۆ فەرمانگەکانی دەوڵەت ١٥ ڕۆژ ئەگەر قەرزار شوێنی دانیشتنی دیار نەبوو) جێبەجێکردنی ئارەزوومەندانەی کرد لە ڕسومات دەبەخشرێ.

## ڕێکارەکانی جێبەجێکردنی بەزۆر:

### ئامادەبون لە بەڕیوەبەرایەتی جێبەجێکردن:

ئەگەر قەرزار لە ماوەی دیاریکراودا سەنەدەکەی جێبەجێ نەکرد و نارەزایی بەرامبەر سەنەدەکە نیشان نەدا، ئەوا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن نامەی ئامادەبوونی بۆ دەنێرێ کە تیایدا داوای لێ دەکرێ لە ماوەیەکی دیاریکراو دا لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ئامادە بێ.

### ئامادەکردنی بەزۆر:

دوای بەسەرچونی ماوەی دیاریکراو ئەگەر قەرزار لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ئامادە نەبوو ئەوا جێبەجێکاری داد فەرمانی (ئامادەکردنی بەزۆر) ی لە دژ دەردەکا.

فەرمانەکە دەدرێ بە پۆلیس لەو ناوچەیەی کە قەرزارەکەی لێ دەژی بۆ جێبەجێکردنی (م 22).

قەرزار لەژێر چاودێری پۆلیس (بە مەخفوری) دەهێنرێتە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن (م 22).

ئەگەر گومانی ئەوە هەبوو کە خۆی شاردۆتەوە ئەوا دەکرێ بۆ باش بەڕێوەچونی کاروباری جێبەجێکردن و بەرقەراربونی عەدالەت بە فەرمانی دادوەری لێکۆڵینەوە پۆلیس ناوماڵەکەی بپشکنێ (ڕێسای گشتی).

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی داد
بەڕێوەبەرایەتی گشتی فەرمانگەکانی داد
بەڕێوەبەرایەتی جێ بەجێ کردنی/________

ژمارەی دۆسیە/
ڕێکـــەوت: / / ٢٠١

**ئامادەکردنی بە زۆر**

بۆ/ ئەفسەری بنکەی پۆلیسی________

قــەرزار:________
ناونیشان:________
پاڵپشت بە ئەحکامی بڕگەی دووەمی مادەی(٢٢)لە یاسای جێ بەجێ کردن،بڕیار درا بە ئامادەکردنی قەرزار لەم بەڕێوەبەرایەتی بە بە زۆر(جبراً)
لەگەل ڕێزدا...

**جێ بەجێ کاری داد**

تێبینی:
________
________

## ناڕەزایی دەربڕین لەو سەنەدانەی لە لایەنێکی ناڕەسمیەوە (ناحکومیەوە) دەرچوون

**ئەگەر سـەندەکە لە لایەنێکی ناحکـومیەوە دەرچـوو بـوو** قەرزار بـۆی هەیە لە بەڕێـوەبەرایەتی جێبەجێکـردن ناڕەزایی لە دروستی سەنەدەکە پێشان بدا. مەبەست لە سەند لە لایەنێکی ناحکومیەوە دەرچووبێ هەر سـەنەدێکی جێبەجێکردنە کە ئەو لایەنەی دەری کردوە بە سیفەتی فەرمی دەری نەکردوە. ئەم سەنەدانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١) پەڕاوی بازرگانی کە توانای دەستاودەستیان هەیە (کومپیالە و سەفتەجە و چەك)، (م ١٤، أ)
٢) سەنەدێك دانپێدانان بە مافی شەخسی تێدا بێ (م ١٤، ب)
٣) سەنەدێك ئیسپاتکردنی مافی شەخسی تێدا بێ (م ١٤، د)

### ئەگەر قەرزار ناڕەزایی لە دروستی سەنەدی ناڕەسمی پێشان دا:

**١)** ئەوا جێبەجێکاری داد لە پشتی سەنەدەکە ئاماژە بە ناڕەزایی قەرزار دەدا.

**٢)** جێبەجێکاری داد داوا لە خاوەنقەرز دەکا (خاوەن سەنەدەکە) لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ئامادە بێ و سـەنەدەکەی بباتەوە.

**٣)** خاوەنقەرز تێـدەگەیەنرێ ئەگەر ئـارەزوو بـکا ناڕەزایی بگـرێ ئەوا دەتـوانێ پەنا بـۆ دادگـای پسپۆڕ بـبا بـۆ یەکلایی کردنەوەی کێشەکە.

### ئەگەر قەرزار دوای ماوەی یاسایی نارەزایی لە دروستی سەنەدی نارەسمی پێشان دا:

ئەگەر لەبەر هەر هۆیەك بەدەر لە ویستی خۆی قەرزار نەیتوانی لە ماوەی یاساییدا (٧ – ١٥ – ٣٠ رۆژ) نارەزایی بەرامبەر سەنەدی جێبەجێکردن دەربڕێ و دواتر نارەزایی پێشان دا ئەوا جێبەجێکاری داد بۆی هەیە بەگوێرەی کەیسەکە نارەزاییەکە بەهەند وەربگرێ یان نا.

بڕیاری جێبەجێکاری داد لە هەردوو حاڵەتەکەدا شیاوی تانە لێگرتنە بە تەزەلوم و تەمیز.

### ڕێکارەکانی نارەزایی دەربڕین لەو سەنەدانەی کە لە لایەنێکی حکومیەوە دەرچوونە:

ئەگەر سەنەدەکە لە لایەنێکی حکومیەوە دەرچوبوو ئەوا قەرزار ناتوانێ لای بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن نارەزایی بەرامبەر سەنەدەکە پێشان بدا.

ئەگەر قەرزار نارەزایی هەبوو ئەوا دەبێ بچێ لای دادگای پسپۆر تانە لە سەنەدەکە بگرێ.

دەبێ سەنەدەکە یەکێك بێ لەمانەی خوارەوە :

١) بڕیاری دادگا (م ٩)
٢) سەنەدێك کە ئیسپاتی مافی عەینی دەکا (م ١٤، ج)
٣) کەفالەی بەردەم جێبەجێکاری داد (م ١٤، هـ)
٤) بەلگەنامەی تۆماری عەقاری هی مانەوەی قەرز دوای ڕەهن (م ١٤، و)
٥) یەکێك لەو حوجەت و بڕیار و فەرمانانەی کە یاسایێك هێزی جێبەجێکردنی داوەتێ (م ١٤، ز).

ئەگەر بەلگەیەکی لە دادگا هێنا کە تانەی گرتوە ئەوا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن دەسبەجێ ڕێکارەکانی جێبەجێکردن دەوەستێنێ (م ٥٣)، تا دادگا مەسەلەکە دەبڕێنێتەوە.

## مردنی قەرزار پێش دەسپێکردنی جێبەجێکردن

ئەگەر پێش دەسپێکردنی جێبەجێکردن قەرزار بمرێ ئەوا خاوەنقەرز دەتوانێ بڕیاری دادگا پێشکەشی بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بکا وە داوا بکا جێبەجێکردن لەسەر میراتی قەرزارەکەی بکرێ. ئەگەر سەنەدی جێبەجێکردنەکە بڕیاری دادگا نەبوو وە میراتگرەکانی قەرزار ئامادە نەبوون قەرزەکە لە میراتەکە بدەنەوە ئەوا خاوەنقەرز دەتوانێ پەنا بباتە بەر دادگای پسپۆر بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەکە.

جێبەجێکاری داد لەخۆیەوە بەگوێرەی یاسا خاوەنقەرز سوێند دەدا (سوێندی ئیستیزهار – یمین الاستظهار) بۆ دڵنیا بوون لەوەی کە قەرزەکەی بە هیچ شێوەیەك وەرنەگرتوەتەوە (م ٣٧ ، یەکەم).

دوای سوێندخواردن ڕێکارەکانی جێبەجێکردن دەستپێدەکا و جێبەجێکاری داد پێراگەیاندن بۆ هەموو میراتگرەکان دەنێرێ.

## مردنی قەرزار دوای دەسپێکردنی ڕێکارەکانی جێبەجێکردن:

١) ئەگەر دوای دەستپێکردنی ڕێکارەکانی جێبەجێکردن و دوای ئەوەی قەرزار نامەی پێراگەیاندنی بەدەست دەگا بمرێ، ئەوا ڕێکارەکانی جێبەجێکردن بە شێوەیەکی کاتی دەوەستێنرێن.

٢) جێبەجێکاری داد بەگوێرەی یاسا بێ ئەوەی هیچ لایەنێك داوای لێکردبێ خاوەنقەرز سوێند دەدا (سوێندی ئیستیزهار – یمین الاستظهار) بۆ دڵنیا بوون لەوەی کە قەرزەکەی بە هیچ شێوەیەك وەرنەگرتۆتەوە (م ٣٧، یەکەم).

٣) دەبێ خاوەنقەرز سوێندی ئیستیزهار بەم شێوەیەی لە م ١٢٤ یاسای ئیسپاتدا هاتوە لەبەردەم جێبەجێکاری داد بخوا.

٤) ئەگەر خاوەنقەرز ڕازی نەبوو سوێند بخوا ئەوا ئەوە بە نیشانەی ئەوە دادەنرێ کە قەرزەکەی وەرگرتۆتەوە جێبەجێکردن بەیەکجاری دەوەستێنرێ

٥) ئەگەر خاوەنقەرز سوێندی ئیستیزهار ی خوارد ئەوا ڕێکارەکانی جێبەجێکردن لەسەر میراتی قەرزار بە پێی قەسام شەرعی دەستپێدەکاتەوە.

٦) بە پێی قەسامی شەرعی میراتی قەرزار دەستنیشان دەکرێ و قەرزەکەی لێ دەردەهێنرێ ئینجا ئەوەی مایەوە بەسەر میراتگرەکاندا دەشێ دابەش بکرێ (لا ترکة الا بعد سداد الدین).

٧) ئەگەر میراتی قەرزارەکە دیار نەبێ و میراتگرەکان نکوڵی بکەن لای ئەوانە ئەوا دەبێ خاوەنقەرز بە بەڵگەیەکی نوسراو بیسەلمێنێ کە میراتەکە لە کوێیە ئەگەر بیەوێ بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بەردەوام بێ لە ڕێکارەکانی جێبەجێکردن.

٨) ئەگەر خاوەنقەرز نەیتوانی بە بەڵگە بیسەلمێنێ کە میراتەکە لە کوێیە ئەوا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ئاگاداری دەکاتەوە کە ئەگەر بیەوێ ڕێکارەکانی جێبەجێکردن بەردەوام بێ دەبێ پەنا بۆ دادگای پسپۆڕ ببا.

## دابەشکردنی میرات پێش دانەوەی قەرزەکە

١) ئەگەر پێش دانەوەی قەرزەکە میراتگرەکان دەستی خۆیان پێشخست و میراتەکەیان لە نێوان خۆیان دابەش کرد، ئەوا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن لەسەر داوای خاوەنقەرز (داواکاری جێبەجێکردن) دەتوانێ قەرزەکەیان لێ بسەنێتەوە هەریەکەیان بە ڕێژەی بەشی خۆی لە میراتەکە.

٢) جێبەجێکاری داد بەگوێرەی یاسا بێ ئەوەی هیچ لایەنێك داوای لێکردبێ خاوەنقەرز سوێند دەدا (سوێندی ئیستیزهار – یمین الاستظهار) بۆ دڵنیا بوون لەوەی کە قەرزەکەی بە هیچ شێوەیەك وەرنەگرتۆتەوە (م ٣٧ ، یەکەم).

٣) ئینجا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن نامەی پێراگەیاندن بۆ هەموو میراتگرەکان دەنێرێ بۆ ئەوەی لە ماوەی دیاریکراو بەگوێرەی یاسا ئارەزومەندانە قەرزەکە هەریەك بەگوێرەی بەشەمیراتی خۆی بداتەوە.

٤) دەشێ جێبجێکردنی بەزۆر لەدژی میراتگرەکان ئەنجام بدرێ هەریەکەیان بەگوێرەی بەشەمیراتەکەی.

## ئەگەر مەبلەغی قەرزەکە لە بەهای میراتەکە زیاتر بوو

ئەگەر میراتی قەرزار بەشی دانەوەی قەرزەکەی نەکرد ئەوا سامانە ماوەکە بەگوێرەی ڕێساکانی یاسای مەدەنی بۆ دانەوەی قەرزەکە تەرخان دەکرێ (لا ترکة الا بعد سداد الدیون)، بەڵام یاسا ڕێگا نادا داوا لە میراتگرەکان بکرێ لە سامانی تایبەتی خۆیان باقی قەرزەکە بدەنەوە چونکە هیچ کەس ناچار و دەربەست ناکرێ قەرزی کەسێکی تر بداتەوە (ڕێسای گشتی).

## نارەزایی میراتگرەکانی قەرزار لە سەنەدێك کە لەلایەنێکی ناحکومیەوە دەرچوە

ئەگەر سەنەدی جێبەجێکردن پەڕاوی بازرگانی بوو یان سەنەدی دانپێدانان بەقەرز بوو یان سەنەدی ئیسپاتکردنی حەق شەخسی بوو (واتە پەرەگرافی أ ب د لە مادەی ١٤) ئەوا ئەگەر میراتگرەکان نارەزاییان پیشاندا یان منداڵیان تیدا بوو ئەوا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ڕێکارەکانی جێبەجێکردن دەوەستێنێ و داوا لە خاوەنقەرز دەکا سەنەدەکە وەرگرێتەوە و ئەگەر ئارەزوو بکا دەتوانێ بەگوێرەی یاسا لە دادگای تایبەت مەسەلەی دروستی قەرزەکە یەکلا بکاتەوە (م ٢٦ ، چوارەم).

## مردنی خاوەنقەرز پێش ئەوەی سوێندی ئیستیزهار بخوا

ئەگەر دوای دەسپێکردنی ڕێکارەکانی جێبەجێکردن قەرزار مرد و خاوەنقەرزیش پێش ئەوەی سوێندی ئیستیزهار بخوا بمرێ ئەوا جێبەجێکاری داد بەپێی یاسا بێ ئەوەی داوای لێ بکرێ میراتگرەکانی خاوەنقەرز سوێند دەدا (سوێندی ئیستیزهار – يمين الاستظهار) بۆ دڵنیا بوون لەوەی کە زانیارییان نیە کە خاوەنقەرز پێش مردنی قەرزەکەی بە هیچ شێوەیەك قەرزەکەی وەرگرتبێتەوە (م ١١٢ یاسای ئیسبات).

ئەگەر میراتگرەکان منداڵیان تێدا بوو منداڵەکە سوێند نادرێ.

## بەتاڵکردنەوە یان هەموارکردنەوەی حوکمێك کە پێشتر جێبەجێکراوە:

**چی ڕوو دەدا ئەگەر حوکمێك دوای ئەوەی لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردنەوە جێبەجێ دەکرێ لەلایەن دادگای باڵاترەوە بەتاڵ یان هەموار بکرێتەوە؟**

ئەگەر حوکمەکە هەمووی یان بەشێکی بەتاڵ کرایەوە ئەوا سەبارەت بەو بەشەی بەتاڵکراوەتەوە دۆخەکە وەك کاتی پێش جێبەجێکردنی لێ دەکرێتەوە بێ ئەوەی پێویست بە حوکمێکی نوێ بکات.

ئەگەر حوکمەکە هەموار کرایەوە ئەوا بەگوێرەی هەموار کردنەوەکە کار دەکرێ کە لەوانەیە لە خاوێنەرز بسەنرێتەوە یان زیاتری بدرێتێ بەپێی حاڵ.

## وەستاندنی ڕێکارەکانی جێبەجێکردن

بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بەگوێرەی یاسا پابەندە کە لە هەندێك حاڵەتدا ڕێکارەکانی جێبەجێکردن دوا بخا یان بیوەستێنێ.

جێبەجێکاری داد دەسەلاتی تەقدیری هەیە لە حالەتی تردا ڕێکارەکانی جێبەجێکردن بوەستێنێ ئەگەر لەو قەناعەتەدا بوو دادپەروەری وا دەخوازێ ڕێکارەکان بوەستێنێ بۆ پاراستنی بەرژەوەندی یاسایی لایەنێك:

بۆ نمونە: دواخستنی ڕێکارەکانی جێبەجێکردن بە چۆڵکردنی عەقار تا دوای ئەوەی منداڵەکانی قەرزار تاقیکردنەوەی قوتابخانەیان تەواو دەکەن.

### ئایا لە کاتی وەستاندنی ڕێکارەکانی جێبەجێکردندا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن هیچ کارێکی جێبەجێکردن لە دۆسیەی جێبەجێکردن دەکا؟

لە کاتی وەستاندنی ڕێکارەکانی جێبەجێکردندا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن هیچ کارێکی جێبەجێکردن لە دۆسیەکە ناکا تەنها ئەوە نەبێ ئەگەر زەرور بێ بۆ پاراستنی سامانی دەستبەسەر داگیراو.

بۆ نمونە: ئەگەر پاراستنی مولکی دەستبەسەر داگیراو زۆری تێبچێ یان مانەوەی توشی زیانی بکا ئەوا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن هەرچەندە ڕێکارەکانی جێبەجێکردنی وەستاندوە دەتوانێ سامانە دەستبەسەر داگیراوەکە بفرۆشێ و حیجزەکە بخاتە سەر بەهاکەی.

## لەم حالەتانەی خوارەوە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن دەبێ بەپێی یاسا ڕێکارەکانی جێبەجێکردن بوەستێنێ:

## ١. نارەزاییگرتن لە بڕیاری غیابی (بێ ئامادەبوون)

ئەگەر قەرزار بە غیابی خۆی- واتە بێ ئەوەی خۆی لە دادگا ئامادە بێ- بڕیاری لە دژ دەرچێ و دواتر لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن نامەی پێراگەیاندنی بۆ هات کە داوای لێ کرا بڕیارەکە جێبەجێ بکا، ئەگەر قەرزار ڕۆیشتە دادگایەکە و

نارەزایی لە بـڕیارە غیـابییەکە گـرت ئەوا هەر بەڵـگەیەك لە دادگـاوە بهێـنێ کە نارەزایی گرتـوە دەبێ دەسـبەجێ ڕێـکارەکانی جێبەجێکردن بوەستێ (م ٥٣).

پسولەی دانی ڕسوماتی دادوەری بەڵگەیەکی کافیە بۆ پێشاندانی ئەوەی قەرزار نارەزایی پێشکەشی دادگا کردوە.

بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ئەو دەسەڵاتەی نیە تەماشای ئەوە بکا ئاخۆ قەرزار لە ماوەی یاساییدا (١٠ ڕۆژ) نارەزایی گرتوە یان نا، یان مەرجە یاساییەکان لە نارەزایەتی گرتنەکەیدا هەیە یان نا.

### ئەنجامەکانی نارەزاییگرتن:

١) **پشت ڕاستکردنەوە:** ئەگەر دادگا بڕیارە غیـابیەکەی خـۆی کە نارەزایی لێگیراوە پشت ڕاسـتکردەوە و خاوەنقەرز بـڕیاری دادگـای بـۆ بەڕێـوەبەرایەتی جێبەجێکـردن هێنـا ئەوا ڕێـکارەکانی جێبەجێکـردن لەو خـاڵەوەی کە لێـی وەسـتابوو دەستپێدەکاتەوە.

٢) **هەڵوەشـاندنەوە:** ئەگەر دادگـا بـڕیارە غیـابیەکەی خـۆی کە نارەزایی لێگـیراوە هەڵوەشـاندەوە ئەوا بەڕێـوەبەرایەتی جێبەجێکردن دۆخەکە وەك کاتی پێش دەسـتپێکردنی ڕێکارەکانی جێبەجێکـردن لێ دەکاتەوە بێ ئەوەی پێویست بە بڕیارێکی نوێی دادگا بکا.

ئەو مەبـلەغەی کە پێش وەسـتاندنی ڕێـکارەکانی جێبەجێکـردن لە قەرزار وەرگیرا بـوو بـۆی دەگەڕێنرێـتەوە و دۆسـیەی جێبەجێکردنەکە دادەخرێ.

٣) **هەموارکردنەوە:** ئەگەر دادگا بڕیارە غیابیەکەی خۆی کە نارەزایی لێگیراوە هەمواکردەوە ئەوا جێبەجێکردنی ئەو بڕگانەی هەموار نەکراونەتەوە دەستپێدەکاتەوە.

ئەو بڕگـانەی هەمـوار کـراونەتەوە بەگـوێرەی هەمـوار کـردنەوەکە دۆخەکە وەك کاتی پـێش دەسـتپێکردنی ڕێـکارەکانی جێبەجێکردن لێ دەکرێتەوە بێ ئەوەی پێویست بە بڕیارێکی نوێی دادگا بکا.

## ٢. تانەگرتن بە تێهەڵچوونەوەی بڕیار (الاستئناف):

ئەگەر یەکێك لە لایەنێك بە بەڵگە پێشان بدا کە تانەی تێهەڵچوونەوەی گرتوە لای دادگای تێهەڵچوونەوە لە بڕیارێك کە لە ژێر جێبەجێکردندایە ئەوا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن دەبێ دەسبەجێ ڕێکارەکانی جێبەجێکردن بوەستێنێ(م ٥٣).

پسولەی دانی ڕسـوماتی دادوەری لە دادگـای تێهەڵچـوونەوە کافیە بـۆ پێشاندانی ئەوەی قەرزار نارەزایی پێشکەشی دادگـا کردوە.

وەك نارەزایی گرتن لە بریاری غیابی لێرەشدا بەڕێوەبەرایەتی جیبەجێکردن ئەو دەسەڵاتەی نیە تەماشای ئەوە بکا ئاخۆ قەرزار لە ماوەی یاساییدا (١٥ رۆژ) تانەی گرتوە یان نا، یان مەرجە یاساییەکان لە تانەکەیدا هەیە یان نا.

ئەگەر بەڵگە هەبوو قەرزار لە دادگا تانەی لە بریارەکە گرتوە، ئەوا بەڕێوەبەرایەتی جیبەجێکردن دەبێ دەستبەجێ ریکارەکانی جیبەجێکردن بوەستێنێ (م ٥٣).

بەڕێوەبەرایەتی جیبەجێکردن پابەند دەبێ بەهەر بریارێك دادگای تێهەڵچوونەوە دەربارەی تانەگرتنەکە دەریدەکا جا بە پشتراستکردنەوەی بریارە تانەلێگیراوەکە بێ، یان بە هەموار کردنەوەی یان هەڵوەشاندنەوەی بێ، بە هەمان شێوە وەك لە ئەنجامی نارەزاییگرتن لە بریاری غیابی باس کرا.

## ٣. تانەگرتن بە تەمیز ئەگەر بریارەکە پەیوەندیدار بێ بە عەقار:

ئەو بریارەی کە لە بەڕێوەبەرایەتی جیبەجێکردن لە ژێر جیبەجێکردندایە دەشێ پەیوەندیدار بێ بە عەقار بۆ نمونە ئەگەر دەربارەی چۆلکردنی عەقار بوو یان پێشگیری کردن لە حیازەی عەقار یان هەر مافێکی عەینی وەك مافی مولکداری، تەسەروفکردن، سودوەرگرتن یان بارمتەی حیازی لە عەقار.

ئەگەر قەرزار بەڵگەیەکی هێنا کە بریارەکەی تەمیز کردۆتەوە و بریارەکە پەیوەندیدار بوو بە عەقار ئەوا ریکارەکانی جیبەجێکردن دەوەستێنرێن.

## ٤. دەرچوونی بریاری وەستاندن لە دادگایەکی پسپۆرەوە:

ئەگەر لایەنێك تانەی لە بریارەکە گرت بەرێگایەکی تر غەیری ئەو سێ رێگایەی کە باس کرا (واتە نارەزایی لە بریاری غیابی و ئیستیئناف و تەمیز لە حاڵەتی عەقار) و بەلگەشی لە دادگایەکە هێنا کە تانەی لە بریارەکە گرتوە، ئەوا بەڕێوەبەرایەتی جیبەجێکردن ریکارەکانی جیبەجێکردن ناوەستێنێ.

تەنها ئەو کاتە ریکارەکانی جیبەجێکردن دەوەستێنرێ ئەگەر دادگا پسپۆرەکە بریارێکی دەر بکا بە وەستاندنی ریکارەکانی جیبەجێکردن تا مەسەلەکە یەکلا دەکاتەوە.

رێگاکانی تانەگرتن لە بریاری دادگا غەیری ئەو سێ رێگایەی کە باس کران ئەمانە دەگرێتەوە:

تانەی تەمیز لە بریارێك پەیوەندیدار نەبێ بە عەقار (الطعن تمييزا في حكم غير متعلق بعقار) ، دووبارەکردنەوەی دادگاییکردن (اعادة المحاكمة) ، راستکردنەوەی بریاری تەمیزی (تصحيح القرار التمييزي) ، یان نارەزایی غەیرە یان (نارەزایی کەسی دیکە - اعتراض الغير ) بەگوێرەی م ١٦٨ یاسای مورافەعاتی مەدەنی.

بۆ نمونە: دادگای بیدائە بریارێك دەردەکا بە وەستاندنی رێکارەکانی جیبەجێکردن دەربارەی سامانی گوازراوە کە کەسێکی سێیەم دەڵێ هی ئەوە تاوەکو مەسەلەکە یەکلا دەبێتەوە (نارەزایی غەیرە – اعتراض الغير).

## ٥. نارۆشنی بڕیاری دادگا کە جێبەجێ دەکرێ:

ئەگەر جێبەجێکاری داد لەو باوەڕەدا بوو کە ئەو بڕیارەی جێبەجێی دەکا هەمووی یان باشێکی نارۆشنە، بۆ نمونە کرێی ماندوبونی پارێزەر لە بڕیارەکەدا دیاری نەکرابێ، ئەوا دەبێ سەیری هاوپێچەکانی بڕیارەکە بکا نەوەك شتێکی تێدابێ کە نارۆشنیەکە روون بکاتەوە.

ئەگەر وەلامی دەست نەکەوت و نارۆشنییەکە مایەوە، ئەوا دەتوانێ ڕێکارەکانی جێبەجێکردن بوەستێنێ و نامە بۆ ئەو دادگایە بنێرێ کە بڕیارەکەی دەرکردوە داوای ڕوونکردنەوەی لێ بکا.

بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن هەر کە ڕوونکردنەوەی تەواوی وەرگرت ڕێکارەکانی جێبەجێکردن دەست پێدەکاتەوە و دەبێ پابەند بێ بە ڕوونکردنەوەکە.

ئەگەر ڕوونکردنەوەی دادگا کافی نەبوو ئەوا جێبەجێکاری داد ئاگاداری داواکاری جێبەجێکردن دەکا کە دەتوانێ سەردانی دادگای پسپۆڕ بکا بۆ ڕوونکردنەوەی نارۆشنیەکە.

## ٦. نارەزایی گرتن لە پەڕاوی بازرگانی و سەنەدێك دانپێدانان بە قەرز یان ئیسپاتکردنی مافی شەخسی تێدایە:

قەرزار بۆی هەیە لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن نارەزایی لە دروستی ئەم جۆرە نوسراوانەی جێبەجێکردن پێشان بدا و ئەگەر وای کرد ئەوا جێبەجێکاری داد ڕێکارەکانی جێبەجێکردن دەوەستێنێ و لە پشتی سەنەدەکە ئاماژە بە نارەزایی قەرزار دەدا.

جێبەجێکاری داد داوا لە خاوەنقەرز دەکا ێ سەنەدەکەی لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بباتەوە.

ئەگەر خاوەنقەرز ویستی دەتوانێ پەنا بۆ دادگای پسپۆڕ ببا بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشەکە.

ئەگەر نارەزاییەکە لەسەر بەشێکی نوسراوەکە بوو ئەوا دەشێ ئەو بەشانەی نارەزاییان لێ نەگیراوە جێبەجێ بکرێن.

## ٧. ئەگەر داواکاری جێبەجێکردن خواستێکی بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بەجێ نەگەیەنێ:

هەندێك جار وا پێویست دەکا جێبەجێکاری داد داوا لە خاوەنقەرز (داواکاری جێبەجێکردن ) دەکا کە نوسراوێکی پێ پیشان بدا کە لایەتی و پەیوەندیدارە بە سەنەدی جێبەجێکردنەوە، یان داوای هەندێك زانیاری لێ دەکا. بۆ نمونە کۆپییێك بهێنێ لەو گرێبەستەی لە نێوان قەرزار و خاوەنقەرزدا هەیە.

یاسا لەسەر خاوەنقەرزی سەپاندوە کە بەدەنگ ئەم جۆرە خواستەی بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردنەوە بێ.

بەگـوێرەی م ٥٠ ئەگەر داواکار لە مـاوەی ٣٠ ڕۆژدا بە دەنـگ خواسـتی بەڕێـوەبەرایەتی جێبەجێکـردنەوە نەهـات ئەوا جێبەجـێکاری داد ڕێـکارەکانی جێبەجێکـردن دەوەسـتێنێ و خـاوەنقەرز دەبێ داوایەکی نـوێ پێـشکەش بـکا ئەگەر بـیەوێ جێبەجێکردن دەست پێ بکاتەوە.

## ٨. لەکاتی مردنی قەرزار ڕێکارەکانی جێبەجێکردن بە شێوەیەکی کاتی دەوەسێنرێن

بڕوانە موحازەرەی پێشوو بە درێژی باسی مردنی قەرزار لە پێش جێبەجێکردن و لە کاتی جێبەجێکردندا کراوە.

## ٩. وازهێنانی خاوەنقەرز لە معامەلەکەی:

ئەگەر خـاوەنقەرز بـۆ مـاوەی ١ سـاڵ لە ئـاخیر مـوراجەعەیەوە سـەردانی بەڕێـوەبەرایەتی جێبەجێکـردنی نەکردەوە ئەوا وا دادەنرێ کە وازی لە معامەلەکەی هێناوەو بەگوێرەی م ٥٠ جێبەجێکاری داد دەتوانێ ڕێکارەکانی جێبەجێکردن بوەستێنێ.

ئەگەر خـاونقەرز بـۆ مـاوەی ٧ سـاڵ لە ئـاخیر مـوراجەعەیەوە سـەردانی بەڕێـوەبەرایەتی جێبەجێکـردنی نەکردەوە ئەوا سەنەدەکەی هێزی جێبەجێکردن لەدەست دەدا (م ١١٢ ) و بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بەیەکجاری واز لە جێبەجێکردنی دەهێنێ.

خاوەنقەرز ناتوانێ ئەم سەنەدە جارێکی دی لە ب ج بەکاربهێنێ و داوای جێبەجێکردنی بکا.

### چـی دەبێ ئەگەر بە ڕێـگەی دووبارە دادگـاییکردنەوە (إعـادة المحاكمـة) تانە لە بڕیارێـك گـیرا کە ئێـستا لە پرۆسـەی جێبەجێکردن دایە لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن؟

دووبارە دادگاییکردنەوە جۆرێکی تانەگرتنی نائاسایییە کە تێیدا داوا دەکرێ پێداچوونەوە بە بڕیارێکی دادگا بکرێ، کە لە دادگـای ئیـستینئاف، لە دادگـای بەرایی بە پـلەی کـۆتایی یان لە دادگـای باری کەسی دەرچـوو بێ ئەگەر هـاتوو ئەو هەمـوو مەرجانەی کە لە مادە ١٩٦ لە یاسای مورافەعاتی مەدەنی داهاتوە بەردەست بێ، تەنانەت ئەگەر پلەی براوەشی وەرگرتبێ. ئەم شێوە تانەگرتنە نابێتە هـۆی وەسـتاندنی ئۆتۆمـاتیکی ڕێکارەکانی جێبەجێکردن. بەڵام ئەگەر دادگـا ئامـادەبوو پێـداچوونەوە لە بڕیارەکە بکا ئەوا دەبێ فەرمانێکی تایبەت بە وەستاندنی ڕێکارەکانی جێبەجێکردن دەربکا، سەبارەت بەو خاڵانەی پەیوەندیدارن بە دووبارە دادگاییکردنەوە، تاوەکو مەسەلەکە یەکلایی دەکرێتەوە (مادە ٢٠١ مورافەعاتی مەدەنی).

## ئامرازەکانی جێبەجێکردنی بەزۆر

ئەگەر قەرزار ئارەزوومەندانە قەرزەکەی نەدایەوە، بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکـردن دەسـت دەکا بە جێبەجێکـردنی بەزۆر بـۆ ئەمەش پەنا دەباتە بەر چەند ئامراز و ڕێگایەك بۆ ناچارکردنی قەرزار تا پابەند بوونەکەی جێبەجێ بـکا و مـاف بـۆ خـاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە.

**ئامرازەکانی جێبەجێکردنی بەزۆر ئەمانە دەگرێتەوە:**

١. داوای یارمەتی کردن لە پۆلیس.

٢. قەدەغەکردنی قەرزار لە سەفەرکردن.

٣. زیندانیکردنی قەرزار.

٤. دەستگرتن بەسەر سامانی قەرزار و فرۆشتنی بۆ دانەوەی قەرزەکە.

## ✓١٠. داوای یارمەتی کردن لە پۆلیس

زۆرجار قەرزار یان کەسوکارەکەی ڕێگری دەکەن لە ئەنجامدانی ڕێکارەکانی جێبەجێکردن و لێ ناگەڕێن فەرمانبەری جێبەجێکردن کارەکانی بکا.

یاسای جێبەجێکردن ڕێگای بە فەرمانبەری جێبەجێکردن داوە کە داوای یارمەتی لە پۆلیس بکات لە کاتی پێویست بۆ زاڵبوون بەسەر هەر ڕێگری و کۆسپێك کە قەرزار یان کەسوکاری لە دژی ڕێکارەکانی جێبەجێکردن دروستی دەکەن.

ئەو هێزەی بەکار دەهێنرێ دەبێ لەگەڵ ڕادەی بەرەنگاری قەرزار بگونجێ و نابێ زیادەڕەوی لەبەکارهێنانی هێزدا بکرێ واتە دەبێ تەنها ئەوەندە هێز بەکاربهێنرێ تا فەرمانبەری جێبەجێکردن بتوانێ ڕێکارەکانی جێبەجێکردن تەواو بکا.

بەگوێرەی م ٢٨ فەرمانبەری جێبەجێکردن بۆی هەیە داوای یارمەتی لە نزیکترین بنکەی پۆلیس بکات بۆ نەهێشتنی ئەو ڕێگری و بەرهەڵستیەی توشی دەبێ لە کاتی بەجێهێنانی ئەرکەکەیدا و داوای بەکارهێنانی هێز بکا ئەگەر پێویست بوو بۆ تەواوکردنی ڕێکارەکانی جێبەجێکردن.

بەگوێرەی پەرەگرافی دوو لە م ٢٨ لێپرسراوی بنکەی پۆلیس پابەندە بەوەی هێزێکی کافی لەگەڵ فەرمانبەرەکە بنێرێ بۆ ئەوەی بتوانێ ئەرکەکانی ئەنجام بدا. ئەگەر ئەو هێزەی لە بنکەی پۆلیسەکە هەیە کافی نەبوو ئەوا بەرێوەبەری بنکەکە دەبێ پەیوەندی بە بەرپرسەکانی بکا بۆ ئەوەی هێزێکی کافی بۆ ئەم مەبەستە دابین بکرێ.

### چی دەبێ ئەگەر پۆلیس ڕازی نەبوو یارمەتی فەرمانبەری جێبەجێکردن بدەن؟

پەرەگرافی سێیەم لە م ٢٨ بە تاوانی داناوە ئەگەر پۆلیس بە ئەرکەکانی سەرشانی هەڵنەسێ کە داوای لێ دەکرێ وە یارمەتی فەرمانبەری جێبەجێکردن نەدا.

پۆلیسە کەمتەرخەمەکە بە گوێرەی یاسای سزادان بەرپرسیار دەبێ کە لە ژێر م ٣٣١ یاسای سزادانی ساڵی ١٩٦٩ سزاکەی حەبسە، واتە زیندانی لە ٢٤ کاتژمێر بۆ ٦ مانگ.

### ئامادەکردنی مەحزەرێك بە بەرەنگاری قەرزار

فەرمانبەری جێبەجێکردن دەبێ مەحزەرێك بە ڕووداوەکانی بەرهەڵستی قەرزار پڕ بکاتەوە و بیداتە جێبەجێکاری داد.

جیبەجێکاری داد نامە بۆ دادگای لێکۆڵینەوە لە ناوچەکە دەنوسێ و لەگەڵ مەحزەرەکە بۆیانی دەنێرێ بۆ ئەوەی دادگا لێکۆڵینەوەی یاسایی دژی ئەو کەسە دەست پێبکا کە ڕێگای گرتوە لەوەی فەرمانبەری دەوڵەت بە ئەرکەکانی سەرشانی ئەنجام بدا.

## ✓ ٢٧. قەدەغەکردنی قەرزار لە سەفەرکردن

### مافی مرۆڤ و قەدەغەکردنی قەرزار لە سەفەرکردن:

بەکارهێنانی ڕێگای قەدەغەکردنی قەرزار لە سەفەرکردن ئازادی تاکەکەس لە سەفەرکردن بەرتەسك دەکاتەوە کە دەستوری عێراق هی ساڵی ٢٠٠٥ و پەیماننامە نێودەوڵەتیەکانی مافی مرۆڤ ئەم ئازادییەیان پاراستوە بۆیە دەبێ ئەم ڕێگایە تا دەکرێ کەمتر پەنای بۆ ببردرێ.

پەرەگرافی یەکەم ، مادە ٤٤ لە دەستوری عێراق هی ساڵی ٢٠٠٥ (هاوڵاتی عێراق ئازادی گوزەر کردن و سەفەرکردن و نیشتەجێبوونی لە ناو عێراق و دەرەوەی عێراق هەیە.

م ٤٤، الفقرة الاولى من دستور العراق لسنة ٢٠٠٥: للعراقي حرية التنقل والسفر والسكن داخل العراق وخارجه).

## یاسای جێبەجێکردن و قەدەغەکردنی قەرزار لەسەفەرکردن:

ئەگەر قەرزار نیازی سەفەری دەرەوەی عێراقی هەبوو بۆ ئەوەی خۆی لەدەست ڕێکارەکانی جێبەجێکردن دەرباز بکا کە لە دژی ئەنجام دەدرێ، خاوەنقەرز دەتوانێ داوا لە جێبەجێکاری داد بکا کە قەرزار لە سەفەرکردن قەدەغە بکا.

مادە ٣٠: ئەگەر جێبەجێکاری داد قەناعەتی بە ڕوونکردنەوەی خاوەنقەرز هێنا کە قەرزار لەوانەیە لەدەست قەرزەکە ڕا بکاتە دەرەوەی عێراق ئەوا دەتوانێ داوا لە قەرزار بکا کە پێش سەفەرەکەی کەفالەتێك بۆ دانەوەی قەرزەکە پێشکەش بکا.

ئەگەر قەرزار کەفالەتەکەی پێشکەش نەکرد ئەوا جێبەجێکاری داد دەبێ بڕیاری قەدەغەکردنی قەرزار لە سەفەرکردن دەربکا.

## دەبێ ئەم مەرجانە هەبن بۆ ئەوەی بتوانرێ بڕیاری قەدەغەکردنی قەرزار لەسەفەرکردن دەربکرێ:

١. خاوەنقەرز داوایەك پێشکەش بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بکا کە تێیدا ئیحتیمالی هەڵاتنی قەرزار بسەلمێنێ و داوا بکا قەرزار لەسەفەرکردن قەدەغە بکرێ .

٢. جێبەجێکاری داد بگاتە ئەو قەناعەتە کە مەبەستی قەرزار لە سەفەرەکەی ڕاکردنە لە قەرز.

٣. جێبەجێکاری داد داوا لە قەرزار بکا کە پێش سەفەرەکەی کەفالەتێك بۆ دانەوەی قەرزەکە پێشکەش بکا.

٤. قەرزار کەفالەت بۆ دابینکردنی قەرزەکەی پێشکەش نەکا.

٥. قەرزار جێگرێك بۆ خۆی دەسنیشان نەکا کە لەجیاتی ئەو کارەکان بکا لە معامەلەی جێبەجێکردنەکە.

٦. قەرزار سامانی دیاری نەبێ کە بتوانرێ دەستی بەسەردا بگیرێ و کافی بێ بۆ دانەوەی قەرزەکە.

٧. بڕیاری قەدەغەکردنی قەرزار لەسەفەرکردن لەلایەن جێبەجێکاری دادەوە دەردەچێ نەك هەر فەرمانبەرێك لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن.

## دەکرێ بڕیاری قەدەغەکردن لە سەفەر بە شێوەی وەلائی دەربچێ ؟

نەخێر ناکرێ بە بڕیاری وەلائی واتە بێ گوێگرتن لە هەردوولا دادوەر سەفەرکردنی قەرزار قەدەغە بکا .

بەڵام دەشێ دادوەر بڕیارێکی دادوەری خێرا دەربکا کە سەفەرکردنی قەرزار قەدەغە بکا دوای گوێگرتن لە هەردوولا .

## بڕیاری قەدەغەکردن لە سەفەر چۆن جێبەجێ دەکرێ؟

١) جێبەجێکاری داد بڕیاری قەدەغەکردنی قەرزار لەسەفەرکردن دەرەکا بڕیارەکە بەسەر فرۆکەخانە و خاڵە سنوریە نێودەوڵەتیەکاندا دەگشتێندرێ بۆ ئەوەی نەهێڵرێ قەرزار لە عێراق دەرچێ.

٢) ئەگەر قەرزار لە کاتی دەرچوونی بڕیارەکە ئامادە بوو ئەوا پاسەپۆرتەکەی لێ دەسەنرێتەوە و داوای لێ دەکرێ هەوڵی سەفەرکردن نەدا. ئەگەر قەرزار لە کاتی دەرچوونی بڕیارەکە ئامادە نەبوو ئەوا بە نامە ئاگادار دەکرێتەوە کە پاسەپۆرتەکەی ڕادەستی ب ج بکا و هەوڵی سەفەرکردنی دەرەوەی وڵات نەدا.

٣) پاسەپۆرتی قەرزار بە ئەمانەت تا کاتی پێویست لە ب ج بۆی هەڵدەگیرێ.

## تانەگرتن لە بڕیاری قەدەغەکردنی قەرزار لە سەفەرکردن:

ئەگەر جێبەجێکاری داد بڕیاری قەدەغەکردنی قەرزار لەسەفەرکردن دەربکا یان داوای خاوەنقەر ڕەت بکاتەوە و بڕیارەکە دەرنەکا لە هەردوو حاڵەتەکە دەشێ بڕیاری جێبەجێکاری داد تانەی لێ بگیرێ بە تەزەلوم و بە تەمیز (م ١١٨ - ١٢٣).

لە هەموو ئەمانەدا ڕوون دەبێتەوە کە ناکرێ قەرزار لە سەفەرکردن قەدەغە بکرێ ئەگەر مەبەستی لە سەفەرکردنەکەی پەیوەندیدار نەبێ بە قەرزەوە بۆ نمونە بۆ چارەسەری پزیشکی، یان گەشتیاری یان بازرگانی یان بە مەبەستی خوێندن سەفەر بکا.

# ٣٧ . زیندانیکردنی قەرزار (حبس المدین)

## بڕیاری زیندانیکردنی قەرزار و مافی مرۆڤ:

ئازادی مافێکی سەرەتایی تاکەکەسە و نابێ بە هیچ شێوەیەك بەرتەسك بکرێتەوە تەنها لە حاڵەتی زۆر زەروردا نەبێ لە چوارچێوەی یاسایێکی دادپەروەرانەدا.

ئەگەر هەر ڕێگەیەکی تر هەبێ بۆ جێبەجێکردنی پابەندبونەکەی نابێ بڕیاری زیندانیکردن دەربکرێ.

جێبەجێکاری داد / دادوەر دەبێ دڵنیا بێ هەمو مەرجەکانی کە یاسای جێبەجێکردن دایناوە بەدی هاتوە پێش ئەوەی بڕیاری زیندانیکردن دەربکا.

## ئەگەر قەرزار ئارەزومەندانە قەرزەکەی نەداوە چی دەبێ؟

ئەگەر قەرزار ئارەزومەندانە قەرزەکەی نەدایەوە ئەوا یاسا ڕێگای داوە بە دەسەڵاتی گشتی بەزۆر ماف لە قەرزارەکە بسەنێتەوە و بیداتەوە بە خاوەنقەرز.

یاسا: یاسای جێبەجێکردن ژمارە 45 ساڵی 1980.

دەسەڵاتی گشتی: بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن

یاسای جێبەجێکردن، م 40 - 49، ڕێگای داوە بە چەند مەرجێك قەرزار بۆ ماوەیەکی دیاریکراو زیندانی بکرێ بۆ ئەوەی ناچار بێ پابەندبونەکەی جێبەجێ بکا.

## مەرجەکانی زیندانیکردنی قەرزار:

**١. دەبێ لەسەر داوای خاوەنقەرز بێ (م 40 / یەکەم) :**

دەبێ خاوەنقەرز داوای زیندانیکردنی قەرزار بکا.

ئەگەر خاوەنقەرز داوای زیندانیکردنی نەکردبێ دادوەر ناتوانێ فەرمانی زیندانیکردن دەربکا.

**٢. تەنها دادوەری پسپۆڕ دەتوانێ فەرمانی زیندانیکردن دەربکا (م 40 / یەکەم) :**

ئەگەر جێبەجێکاری داد دادوەر بێ بە دادوەری پسپۆڕ دادەنرێ و بۆی هەیە بڕیاری زیندانیکردنی قەرزار دەربکا بەڵام ئەگەر جێبەجێکاری داد دادوەر نەبێ ئەوا ناتوانێ بڕیاری زیندانیکردنی قەرزار دەربکا.

ئەگەر جێبەجێکاری داد دادوەر نەبوو ؟

ئەگەر لە بەڕێوەبەرایەتییەکی جێبەجێکردن جێبەجێکاری داد دادوەر نەبوو ئەوا کۆپییەك لە دۆسیەی جێبەجێکردن دەنێردرێ بۆ دادوەری پلە یەك لە دادگای بەرایی ناوچەکە بۆ ئەوەی دوای تاوتوێکردنی کەیسەکە ئەگەر قەناعەتی هات بڕیاری زیندانیکردنی قەرزار دەربکا.

**٣. لەسەر هەمان قەرز تەنها یەك جار قەرزار دەشێ زیندانی بکرێ (م 40 / سێیەم):**

ئەگەر قەرزار جارێك لەسەر قەرزێك زیندانی کرا، ناکرێ لەسەر هەمان قەرز جارێکی تر زیندانی بکرێ ئەگەر هەمو مەرجەکانیش ئامادەبون.

بەڵام دەشێ ڕێکارەکانی دیکەی جێبەجێکردن پیادەبکرێن.

**٤. دادوەر دەبێ لەو باوەڕەدا بێ کە قەرزار لە توانای دایە پابەندبونەکەی یان بەشێکی جێبەجێ بکا (م 42/ یەکەم) :**

ئەگەر قەرزار نەبون بێ یان لە توانای دا نەبێ پابەندبونەکە جێبەجێ بکا ئەوا ناکرێ زیندانی بکرێ چونکە ئامانج لە زیندانیکردنی قەرزار بۆ ناچارکردنێتی قەرزەکە بداتەوە نەك سزادانی.

ئەگەر سامانی بەرچاوی هەبو ئەوا جێبەجێکردنی بەزۆر سامانەکەی دەگرێتەوە، خۆی نابێ زیندانی بکرێ.

**٥. یاسا ڕێگا نادا قەرزار زیندانی بکرێ ئەگەر 18 ساڵ تەمەنی تەواو نەکردبێ یان لە سەروی 60 ساڵانەوە بێ (م 41/ یەکەم):**

ئەم مەرجە بۆ ڕەچاوکردنی بەها مرۆڤایەتیەکان بەرژەوەندی منداڵ و تەمەندار دەپارێزێ.

**٦. نابێ قەرزار دایك و باوك یان منداڵ یان خوشك و برای خاوەنقەرز بێ (لە داوای نەفەقەدا نەبێ)، (م 41 / سێیەم):**
ئەم مەرجە ڕەچاوکردنی بەها کۆمەڵایەتیەکان و پاراستنی شیرازەی خێزان دانراوە.

**٧. ئەگەر قەرزار موچەخۆری دەوڵەت بێ نابێ زیندانی بکرێ (م 4 / چوارەم):**
دەشێ بەشێك لە موچەکەی حیجز بکرێ بەڵام هێشتا ئەمە بە مامەڵەکردنێکی تایبەت یان ئیمتیاز دادەنرێ بۆموچەخۆرانی دەوڵەت.

**٨. ماوەی زیندانیکردنی قەرزار نابێ لە چوار مانگ زیاتر بێ (م 43):**
دوای ٤ مانگ لە زیندان قەرزار دەبێ ئازاد بکرێ جا ئەگەر قەرزەکەی بداتەوە یان نا.
ئەگەر پابەندبونەکە پەیوەندی بە ڕادەستکردنی منداڵەوە بێ ئەوا دەبێ زیندانیکردنەکە بەردەوام بێ منداڵەکە ڕادەست دەکاتەوە یان دەسەلمێنرێ کە ئیتر ڕادەستکردنەکە لە توانای ئەودا نیە (م 48).

## کەی قەرزار لە زیندان ئازاد دەکری؟

قەرزار لە هەر کام لەم حاڵەتانە لە زیندان ئازاد دەکرێ:
١. ماوەی زیندانیکردنەکەی واتە ٤ مانگ تەواو بکا.
٢. هەرکاتێك خاوەنقەرز داوای ئازادکردنی بکا.
٣. هەرکاتێك قەرزەکەی کە لەسەری گیراوە بداتەوە.
4. هەرکاتێك دەستبەسەر سامانی دا بگیرێ کە بەشی دانەوەی قەرزەکەی بکا.
٥. هەرکاتێك توشی نەخۆشیەك ببێ کە ئومێدی چاکبونەوەی نەبێ بەگوێرەی ڕاپۆرتی پزیشکی کە لە لیژنەیەکی پزیشکی ڕەسمیەوە دەرچوبێ.

## ئایا زیندانیکردن قەرزەکە لەسەر قەرزار پاك دەکاتەوە؟

نەخێر، زیندانیبون ئەستۆی لە قەرزەکە پاك ناکاتەوە و تەنانەت قەرزەکە کەمیش ناکاتەوە. هەرکاتێك دەرکەوت کە قەرزار سامانی هەیە دەشێ جێبەجێکردنی بەزۆر لە دژی بکرێ.
بەڵام ناکرێ جارێکی تر قەرزار لەسر هەمان قەرز زیندانی بکرێتەوە.

**چی دەبێ ئەگەر مەبلەغی قەرز و مەسرەفەکە ڕاستەوخۆ بدرێتە بەڕێوەبەری زیندان؟**

جێبەجێکاری داد کە بڕیاری زیندانیکردن دەردەکا دەبێ لەسەر بڕیارەکە مەبلەغی قەرز و مەسرەف بنوسێتەوە. هەر کە قەرز و مەسرەفەکە ڕادەستی بەڕێوەبەرایەتی زیندان کرا بەڕێوەبەری زیندان دەبێ قەرزارەکە ئازاد بکا بێ ئەوەی چاوەڕێی بڕیاری جێبەجێکاری داد بکا.

دوای ئازادکردنی قەرزار بەڕێوەبەری زیندان دەبێ پارەکە ڕەوانەی بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بکا (م. ٤٧ یاسای جێبەجێکردن).

بسم الله الرحمن الرحيم

تنفيذ/١٣

الجمهورية العراقية
وزارة العـــدل
مديرية تنفيـذ ........................

## مـذكرة الحبس

رقم الاضبارة/
التـــاريخ /
الى مديرية الاصلاح الاجتماعي /
اسم المنفذ عليه ( المـدين ) /
محل اقامته /
مهنتـــه /
عمـــره /
مقدار الدين والمصاريف /
استنادا للمادة (٤٠) من قانون التنفيذ تقرر حبس المدين
مدة لعـدم
فيرجى الاحتفاظ به لديكم مع المذكرة اعتبارا من تاريخه أعلاه ما لم يصدر قرار آخر عن هذه المديرية بشأنه مع مراعاة أحكام المادة « ٤٧ فقرة (٢) » من قانون التنفيـذ •

المنفـذ العـدل القـاضي

### ✓ ٤. دەستگرتن بەسەر سامانی قەرزار و فرۆشتنی بۆ دانەوەی قەرزەکەی

یاسا ڕێگەی داوە کە سامانی دەستبەسەرداگیراو بفرۆشرێ و لە بەهاکەی مافەکانی خاوەنقەرز بدرێتەوە.
دەستبەسەرداگرتن ئەوەیە کە سامانی قەرزار بخرێتە ژێر دەستی دەسەڵاتداری گشتیەوە بۆ ئەوەی نەهێڵرێ خاوەنەکەی (واتە قەرزار) هیچ کردارێکی یاسایی (بۆنموونە فرۆشتن یان بە دیاری بەخشین) یان مادی (بۆ نموونە وەك ڕووخاندنی خانوو) وا بە سامانەکەوە بکا لە زەمانی گشتی دەربیکا یان لە نرخی کەم بکاتەوە و بەم شێوەیە زیان لە بەرژەوەندی خاوەنقەرز بدا لەوەی کە مافی خۆی وەربگرێتەوە هەروەها دەستبەسەرداگرتن بۆ ئەوەیە کە دواتر سامانەکە بە زیادکردنی ئاشکرا بفرۆشرێ و قەرزی خاوەنقەرزی لێ بدرێتەوە.
تەنها جێبەجێکاری داد دەتوانێ بە پێی یاسا بڕیاری دەستگرتن بەسەر سامانی قەرزار و فرۆشتنی دەربکا، فەرمانبەرەکانی تر بۆیان نیە ئەم بڕیارە دەربکەن (م. ٥٥).

### بناغەی یاسایی دەستگرتن بەسەر سامانی قەرزار و فرۆشتنی:

مادە ٥٤ لە یاسای جێبەجێکردن بناغەی یاسایی دەستگرتن بەسەر سامانی قەرزار و فرۆشتنی دارشتوە کە ڕێگا دەدا ئەوەندەی بەشی دانەوەی قەرز و مەسرەف کردن دەکا لە سامانی قەرزار دەستی بەسەردا بگیرێ و بفرۆشرێ.
ئەم بناغەی یاساییە لەو ڕێسا گشتییەوە سەرچاوەی گرتوە کە دەڵێ گشت سامانی قەرزار زەمانی دانەوەی قەرزەکانی دەکا واتە زیمەی سامانی قەرزار بە زەمانی گشتی خاوەنقەرز دادەنرێ (م ٢٦٠ یاسای مەدەنی ڕێکی خستوە).

ئەستوی دارایی **(الذمة المالية) :**

**ئەستوی** دارایی هەموو ئەو مافە شەخسی و عەینی و پابەندبوونە داراییانەیە کە کەسێك هەیەتی یان لەسەریەتی.

**زەمانی گشتی (الضمان العام):**

زەمانی گشتی چەند جیاکەرەوەیەکی هەیە لەوانە ئەوەیە کە:

١) مافی ئەفزەلیەت بە هیچ خاوەنقەرزێك نادا و هەموو خاوەنقەرزەکان یەکسانن لە زەمانی گشتیدا.

٢ ) ماف بە خاوەنقەرزی ئاسایی نادا بەدوای سامانی قەرزار دابچێ (حق التتبع) کە لە زیمەی دەرچووە.

٣ ) هەروەها مافی ئەوە بە خاوەنقەرز نادا کە دەست وەرداتە کاروباری قەرزار لە بەڕێوەبردن و تەسەروف پێوەکردنی سامانەکانی. ئەو قەرزەی لەسەر قەرزارە هەرچەند زۆر بێ کاریگەری ناکاتە سەر مافی قەرزار لەوەی کە مولکەکانی بەڕێوە ببا و تەسەروفیان پێوە بکا تا ئەوکاتەی دادگای پسپۆر یان بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن لەو مافەی بێبەش دەکا.

## مەرجەکانی دەستگرتن بەسەر سامانی قەرزار و فرۆشتنی بۆ دانەوەی قەرزەکەی:

١. دەبێ خاوەنقەرز داوای دەستبەسەرداگرتن بکا - م ٥٥:

بۆ ئەوەی بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بتوانێ دەست بەسەر سامانی قەرزاردا بگرێ دەبێ خاوەنقەرز یان وەکیلەکەی داواکاری دەستبەسەرداگرتن پێشکەش بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بکا کە یان بە شێوەی عەریزە دەبێ یان بە پڕکردنەوەی مەحزەرێك دەبێ لە دۆسیەی جێبەجێکردن.

ئەگەر دوای دەرچوونی بڕیاری دەستبەسەرداگرتن خاوەنقەرز بۆ ماوەی ٣٠ ڕۆژ موراجەعەی معامەلەی دەستبەسەرداگرتنەکەی نەکردەوە و قەرزار داوای هەڵگرتنی دەستبەسەرداگرتنەکەی کرد ئەوا (ج د) ماوەی ٣٠ ڕۆژ دەدا بە خاوەنقەرز بۆ بەدواداچوونی تەواوکردنی ڕێکارەکانی دەستبەسەرداگرتن و فرۆشتن. ئەگەر دوای پێراگەیاندنی خاوەنقەرز سەردانی (ب ج) ی نەکرد، ئەوا (ج د) بڕیاری هەڵگرتنی دەستبەسەرداگرتن دەردەکا (م ٦١ هەموارکراو لە ساڵی ٢٠٠٧).

قەرزی نەفەقە لەبەرئەوەی بۆ ژیان و گوزەرانی خاوەنقەرزەکە بڕیار دراوە بۆیە ئەگەر خاوەنقەرز داوای دەستبەسەرداگرتنیش نەکات بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بۆی هەیە وەك ئیستیسنا لە ڕێسای گشتی ڕێکارەکانی دەستبەسەرداگرتن ئەنجام بدا.

### ٢. دەبێ دەستبەسەرداگرتنەکە بەقەد قەرزو مەسرەفەکەی بێ:

دەبێ تەنها ئەوەندە لە سامانی قەرزار دەستی بەسەردا بگیرێ کە کافی بێ بۆ دانەوەی قەرز و ڕسومات و مەسرەفەکەی واتە تێچوونەکەی، تا بکرێ نابێ زیاتر لەوە دەستی بەسەردا بگیرێ.

بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن کە دەست بەسەر سامانی قەرزار دادەگرێ بە سامانی کەم نرخ و کەم بایەخ دەست پێ دەکا (م. ٥٦).

ئەگەر دوای فرۆشتنی سامانە دەستبەسرداگیراوەکە، بەهاکەی بەشی دانەوەی تەواوی قەرزەکەی نەکرد ئەوا بەهەمان شێوە دەست بەسەر سامانی دیکەی قەرزار دادەگیرێ.

### ٣. ئەو سامانەی دەستی بەسەر دادەگیرێ دەبێ موڵکی قەرزار خۆی بێ هی کەسی دیکە نەبێ:

ئەمە مانای ئەوەیە کە تەنها دەست بەسەر سامانی قەرزار دادەگیرێ و سامانی خەڵکی دی ئەگەر زۆر نزیکیش بن لە قەرزار دەستیان بەسەردا ناگیرێ.

سامانی قەرزار زەمانی گشتی دانەوەی قەرزەکانێتی نەك سامانی کەسوکار و ئەندامانی خێزانەکەی بۆیە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن کە ڕێکارەکانی دەستبەسەرداگرتن ئەنجام دەدا دەبێ دڵنیا بێ لەوەی ئەو سامانەی دەستی بەسەردادەگرێ هی قەرزار خۆی بێ نەك هی کەسی دی.

ئەگەر قەرزار پشکی لە سامانی هاوبەش (مال مشاع) دا هەبوو بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن دەتوانێ تەنها دەست بەسەر پشکی قەرزاردا بگرێ لە سامانەکە نەك هەموو سامانەکە.

### ٤. ناشێ دەستبەسەرداگرتن پێش پێراگەیاندن و بەسەرچوونی ماوەی جێبەجێکردنی ئارەزوومەندانە ئەنجام بدرێ:

دەستبەسەرداگرتنی سامانی قەرزار یەکێکە لە ڕێکارەکانی جێبەجێکردنی بەزۆر بۆیە ناشێ دەست بەسەر سامانی قەرزاردا بگیرێ پێش ئەوەی بە پێراگەیاندن ئاگادار بکرێتەوە لە پێویستی دانەوەی قەرزەکەی و ماوەیەکی یاسایی بدرێتێ بۆئەوەی ئارەزومەندانە جێبەجێی بکا.

قەرزار مافی ئەوەی هەیە کە مۆڵەتی یاسایی بدرێتێ (٧ ڕۆژ، ٣٠ ڕۆژ یان ١٥ ڕۆژ بەگوێرەی کەیسەکە) ناکرێ ئەو مافەی پێشێل بکرێ.

## 5. ئەو سامانەی کە دەستی بەسەردا دەگیرێ دەبێ یەکێك نەبێ لەو سامانانەی کە یاسا قەدەغەی کردوە دەستیان بەسەردا بگیرێ:

ڕێسای گشتی ئەوەیە کە گشت سامانی قەرزار زەمانی دانەوەی قەرزەکانی دەکا بەڵام یاسای جێبەجێکردن قەدەغەی کردوە هەندێك جۆر لە سامان دەستی بەسەردا بگیرێ ئەمەش چونکە دادپەروەری و پاراستنی مافی قەرزار وا دەخوازێ لەبەر ئەوەی سامانەکە پەیوەندی بە ژیان و گوزەرانی قەرزار و خێزانەکەی هەیە یان پەیوەندی بەپێویستیەکانی پیشەکەیەوە هەیە یان بۆ پاراستنی متمانەی نێوان بازرگانان.

## فرۆشتنی سامانی دەستەبەسەرداگیراو:

لە دوای دەستبەسەرداگرتنەکە، قەرزار ماوەی ٣ ڕۆژی پێدەدرێ سەنەدی جێبەجێکردنەکە جێبەجێ بکا، ئەگەر نەیکا سامانەکەی بە زیادکردنی ئاشکرا دەفرۆشرێ.

ئەگەر دەستبەسەرداگرتنەکە بە ئامەدەبوونی قەرزار بوو ئەوا ئەم ٣ ڕۆژە لە ڕۆژی دوای دەستبەسەرداگرتنەکە دەستپێدەکا.

ئەگەر قەرزار لە کاتی دەستبەسەرداگرتنەکە لەوێ نەبوو، ئەوا بە نامە ئاگادار دەکرێتەوە و ٣ ڕۆژەکە لە ڕۆژی دوای پێراگەیاندن دەستپێدەکا (م ٦٩).

بەڵام ئەگەر دەرکەوت سامانە دەستبەسەرداگیراوەکە زوو لە ناودەچێ یان بەهاکەی ئەوەندە نیە کە تێچوونی پاراستنی هەڵبگرێ، ئەوا بۆ پاراستنی بەرژەوەندی هەردوو لا یەکسەر دەست بە فرۆشتنی دەکرێ (م ٧٠).

## ئەگەر دەرکەوت سامانە دەستبەسەرداگیراوەکە یەکێکە لەو سامانانەی کە یاسا قەدەغەی کردوە دەستیان بەسەر دابگیرێ:

ئەرکی قەرزارە ڕوونی بکاتەوە کە سامانێکی دیاریکراو پەیوەندی بە گوزەرانیەوە یان بە پیشەکەیەوە هەیە بۆ ئەوەی نەتوانرێ دەستی بەسەردا بگیرێ .

دوای دەستبەسەرداگرتنیش ئەگەر قەرزار توانی بیسەلمێنێ کە سامانە دەستبەسەرداگیراوەکە یەکێکە لەو سامانانەی کە یاسا قەدەغەی کردوە دەستیان بەسەر دابگیرێ دەبێ (ج د) دەستبەسەرداگرتنەکە هەڵبگرێ، تەنانەت ئەگەر نارەزایی قەرزار لە دەرەوەی ماوەی نارەزایی گرتنیش بێ .

## ئەو سامانانەی کە یاسا قەدەغەی کردوە دەستیان بەسەردا بگیرێ و بفرۆشرێن (م. ٦٢)

### یەکەم- سامانی دەوڵەت:

ئەگەر قەرزار یەکێك لە فەرمانگەکانی دەوڵەت بێ ناکرێ دەست بەسەر سامانی دا بگیرێ لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١- لە دەوڵەت ڕانابینرێ کە پەنا باتە بەر فروفێڵ لە دانەوەی قەرزەکانیدا.

٢- سامانی دەوڵەت بۆ سودی گشتی تەرخان کراوە، دەستبەسەرداگرتن و فرۆشتنەوەی لەگەڵ بەرژەوەندی گشتی ناگونجێ.

٣- متمانە بە هەبوونی دەوڵەت دەکرێ.

٤- ئەگەر جێبەجێکردن لە دژی بکرێ دەوڵەت وەك نەدار دێتەبەرچاو لە هەیبەت و متمانەی دادەبەزێ.

ئەگەر خاوەندارێتی سامانێك کێشەی لەسەر بێ لە نێوان دەوڵەت و تاکەکەس دەشێ دەستی بەسەردابگیرێ چونکە هێشتا هی دەوڵەت نیە.

هەندێك کەس پێیان وایە کەئەمە ناهەق تێدایە بەرامبەر ئەو خاوەنقەرزانەی کە قەرزیان لەسەر دەوڵەتە و ئەمەش وادەکا خەڵك حەز نەکا مامەڵەی بازرگانی لەگەڵ دەوڵەت بکا.

### دوەم – سامانێك بەشێوەیەکی دروست وەقف کرابێت:

وەقف ئەوەیە کە ئەسلی سامانەکە دەبەسرێ و بەروبومی بەردەدرێ و بۆ سودی گشتی یان سودی لایەنێك بەگوێرەی ویستی وەقفکار.

سامانی وەقفکراو لە خاوەندارێتی خاوەنەکەی (وەقفکار) دەردەچێ بۆیە ناتوانێ تەسەروفی یاسایی پێوە بکا وەك ئەوەی بیفرۆشێ رەهنی بکا یان بیکا بە دیاری و کە وەقفکار دەمرێ بە میرات دانانرێ. ئەگەر وەقفکار قەرزار بو ناکرێ دەستبەسەر سامانە وەقفکراوەکە دابگیرێ.

### سێیەم – داهاتی قەرزار تا ئەوەندەی بەشی بژێوی دەکا:

یاسا ڕێگا نادا دەستبەسەر هەمو سامانی قەرزاردا دابگیرێ چونکە ئەمە مافی قەرزار لە ژیانی ئازادانە و سەربەرزانە پێشێل دەکا و بەم جۆرە دژ بە بەرژەوەندی گشتییە. دەبێ لانی کەم ئەوەندە بۆ قەرزار بهێڵرێتەوە کە بەشی بژێوی خۆی و خێزانی بکا.

### چوارەم – کەلوپەلی پێویستی ناوماڵ:

ئەو کەلوپەلانە دەگرێتەوە کە قەرزار و خێزانی لە ناوماڵ پێویستیان پێی هەیەناکرێ دەستییان بەسەردا بگیرێ.
ئەو کەلوپەلانەی ناوماڵ کە هی هاوسەری قەرزارن و هاوسەرەکەی بە پارەی خۆی کریویێتی وەك هەر سامانێکی دیکە وایە کە هی قەرزار نیە و بۆیە ناکرێ دەستی بەسەر دابگیرێ.

**پێنجەم – ئازوخەی پێویست بۆ بژێوی یەك مانگی قەرزار و خێزانەکەی:**
یاسا قەدەغەی کردوە دەست بەسەر ئازوخەی پێویست بۆ بژێوی یەك مانگی قەرزار و خێزانەکەی دابگیرێ.
یاسا وای داناوە کە ئەم ماوەیە کافیە بۆئەوەی قەرزار لە ئاستەنگی دارایی دەربچێ.
ئەگەر ئازوخەی پێویست بۆ بژێوی یەك مانگی نەبوو پارەی کرینی ئازوخەی یەك مانگی لەو سامانەی دەستی بەسەردا گیراوە بۆ دەهێلرێتەوە.

**شەشەم – ئەو ئامراز و ئامێرانەی قەرزار لە کارەکەی یان پیشەکەی پێویستی پێیانە:**
هەمو ئامراز و ئامێرە دەستی و میکانیکی و ئەلکترۆنیانە دەگرێتەوە کە قەرزار خۆی یان بە یارمەتی کرێکار کاریان پێدەکا و زەرورین بۆ بەردەوام بوون لەسەر پیشەکەی.
یاسا بۆیە قەدەغەی کردوە دەست بەسەر ئەم سامانانە دابگیرێ چونکە لەوانەیە قەرزار پیشەکەی لەدەست بدا و ببێتە هۆی نانبڕینی خۆی و خێزانی.

**حەوتەم – کتێبی تایبەت بە پیشەی قەرزار:**
یاسا قەدەغەی کردوە دەست بەسەر کتێبی تایبەت بە پیشەی قەرزار دابگیرێ چونکە لەوانەیە قەرزار بێ ئەم کتێبانە نەتوانێ لە پیشەکەی بەردەوام بێ نانی خۆی و خێزانی ببرێ.

**هەشتەم – کەرەستە و ئامرازی جوتیار:**
یاسا قەدەغەی کردوە دەست بەسەر ئەو کەرەستە و ئامرازانە دابگیرێ کە جوتیار لە پیشەکەی دا بەکاریان دەهێنێ کە بنەتۆ و پەین و ئاژەڵی بەکارهاتوو لە کشتوکاڵ دا دەگرێتەوە.
ئەمە بۆ ئەوەیە کە جوتیار / قەرزار بتوانێ لە کشتوکالکردن بەردەوام بێ.
**نۆیەم – میوە و سەوزە و بەروبوم پێش ئەوەی بەهای دارایی پەیدا بکا ناکرێ دەستیان بەسەردا بگیرێ.**
چونکە ئەمە تەنها زیان بە قەرزار دەگەیەنێ.

**دەیەم – زیاتر لە پێنجیەکی موچە و دەرماڵەی فەرمانبەر** و پۆلیس و سەرباز و کرێکار و خانەنشین و هەرکەسێك موچە یان کرێ لە دەوڵەت وەردەگرێ ئەمەش بۆ پاراستنی ئاستی گوزەرانی قەرزارە.

**یازدەم – پەڕاوی بازرگانی کە شیاوی دەستا و دەست کردنە** کە کومپیالە و سەفتەجە و چەك دەگرێتەوە.
ئەمەش بۆ پاراستنی متانە بە پەڕاوی بازرگانی و متانەی نێوان بازرگانانە.

**دوازدەم – کاری نوسەران و وێنە و نەخشە و تابلۆی هونەری دیکە پێش چاپکردنیان:**
ئەگەر کارەکە تەواو ببو و بۆ فرۆشتن دانرا بوو ئەوا دەکرێ دەستی بەسەرداگیرێ. بەڵام پێش ئەوەی چاپ بکرێ ناکرێ دەستییان بەسەردا بگیرێ.

**سێزدەم – ترەیدمارك و ناونیشانی بازرگانی و پاتەنت و نمونەی پیشەسازی:**
ئەمانە ناکرێ دەستیان بەسەردا بگیرێ چونکە ئەمانە نرخێکی مەعنەوەی زۆریان هەیە و لەدەستدانیان کاریگەری خراپی بەسەر هەموو بزنسەکە دەبێ.

**چواردەم – خانوی نیشتەجێبونی قەرزار و خاوخێزانی دوای مردنی خۆی:**
ئەمانە ناکرێ دەستییان بەسەردا بگیرێ بۆ ئەوەی قەرزار و خێزانەکەی لانەواز نەبن. بە هەمان شێوە ئەگەر خانوی شتەجێبونی قەرزار بۆ سودی گشتی ئیستملاك کرا ئەوا نابێ پارەی قەرەبوەکەی دەستی بەسەرداگیرێ.
پشکی هاوبەش لە خانو یان لە زەوی کە رێکخراوە خانوی لەسەر دروستبکرێ وەك خانو ئەژمار دەکرێ.
یاسا مەرجی دانەناوە کە قەرزار لە خانوەکەدا بژی بۆ ئەوەی دەستی بەسەردانەگیرێ بەو مەرجەی خانوی نیشتەجێبونی دیکەی نەبێ.
ئەگەر قەرزار زیاتر لە یەك خانوی نیشتەجێبونی هەبو دەتوانێ ئەو خانوە هەڵبژێرێ کە دەسبەسەرداگرتنی نەخرێتە سەر.
بەڵام ئەگەر خانو لە ژێر رەهن دا بێت یان قەرزەکە لە بەهای ئەوەوە درست بوبێ دەشێ دەستی بەسەردا بگیرێ بۆ دانەوەی قەرزەکە.

**پازدەم – عەقاری قەرزار کە لەسەر داهاتەکەی دەژی** و لە پێویستی خۆی و خێزانی زیاتر نیە ئەمەش لەبەر هۆکاری مرۆڤایەتی و کومەڵایەتی و بۆ پاراستنی مافی قەرزار.
ئەگەر عەقارەکە لە ژێر رەهن دا بێت یان قەرزەکە لە بەهای ئەوەوە دروست بوبێ دەشێ دەستی بەسەردا بگیرێ بۆ دانەوەی قەرزەکە.
**شازدەم – عەقار بەتەرخانکردن "العقار بالتخصيص"** ناکرێ بەتەنها دەستی بەسەرداگیرێ چونکە لەگەڵ ئەو عەقارەیە کە بۆ خزمەتکردنی تەرخانکراوە.
" عەقار بەتەرخانکردن" لەئەسلدا سامانی گوازراوەیە خاوەنەکەی بۆ خزمەتکردنی عەقار تەرخانی دەکا، بۆ نمونە وەك پانکە و چلچرا کە بە عەقارەوە بەسراوە.
ئەگەر عەقارە خزمەتکراوەکە دەستی بەسەرداگیرا ئەوا ئەم دەستبەسەرداگرتنە عەقار بەتەرخانکردنیش دەگرێتەوە.

## چەند شێوەیەکی معامەلەی جێبەجێکردن:

### ١. جێبەجێکردنی بڕیاری دادگا کە حوکمدراو پابەند دەکا کارێکی دیاریکراو بکا:

پرسیار: شێوازی جێبەجێکردن چۆن دەبێ ئەگەر بڕیارێکی دادگا بۆ جێبەجێکردن هێنرایە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن کە تێیدا دادگای بەرایی حوکمدراو پابەند دەکا دیوارێك دروستبکاتەوە کە رووخاندویەتی؟

(یان بۆ نمونە: پەنجەرەیەك دابخا، یان جۆگەیەك ئاو بگرێتەوە یان بەربدا)

وەڵام :

1) بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن داوا لە حوکمدراو دەکا کە دیوارەکە وەك خۆی بەگوێرەی بڕیاری دادگا دروست بکاتەوە (التنفیذ العینی)

٢) ئەگەر قەرزار جێبەجێکردنی عەینی نەکرد ئەوا پەنا دەبردرێتە بەر جۆرێکی دی لە جێبەجێکردن کە پێی دەگوترێ جێبەجێکردن بە قەرەبوکردنەوە (التنفیذ عن طریق التعویض) بەم شێوەیە :

1 بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن بەیارمەتی پسپۆڕێك تێچوونی دروستکردنەوەی دیوارەکە دەخەملێنێ.

2 بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن داوای بەها خەملێنراوەکە و ڕسومات لە قەرزار دەکا .

٣ ئەگەر قەرزار ئارەزومەندانانە لەماوەی دیاریکراودا قەرزەکەی نەداوە ئەوا جێبەجێکردنی بەزۆر لە دژی دەست پێدەکا بۆ سەندنەوەی بەهای تێچوونەکە و ڕسومات.

## ٢. جێبەجێکردنی بڕیاری دادگا کە حوکمدراو پابەند دەکا منداڵێك ڕادەستی بەخێوکەر بکاتەوە:

**پرسیار:** شێوازی جێبەجێکردن چۆن دەبێ ئەگەر بڕیارێکی دادگا بۆ جێبەجێکردن هێنرایە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن کە تێیدا دادگای بەرایی حوکمدراو پابەند دەکا منداڵێك ڕادەست بکاتەوە؟

**وەڵام:**

١) بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ماوەیەك بۆ حوکمدراو دیاری دەکا کە تێیدا منداڵەکە ڕادەست بکاتەوە.

٢) ئەگەر منداڵەکەی ڕادەست نەکردەوە ئەوا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن دەتوانێ ڕێکارەکانی زیندانیکردنی حوکمدراو دەست پێ بکا.

٣) زیندانیکردنی قەرزار کە حوکمدراوە بە ڕادەستکردنی منداڵ دەشێ لە ٤ مانگیش زیاتر بخایەنێ بەپێچەوانەی حاڵەتەکانی تر زیندانیکردن لەسەر قەرز کە ماوەی ئەوپەڕی زیندانیکردن ٤ مانگە.

٤) قەرزار ئەو کاتە لە زیندان ئازاد دەکرێ ئەگەر منداڵەکە ڕادەست بکاتەوە یان بیسەلمێنێ کە ڕادەستکردنەوەی لە دەرەوەی توانای ئەو دایە، بۆ نمونە منداڵەکە مردوە یان ون بووە.

## ٣. جێبەجێکردنی بڕیاری دادگا کە قەرزار پابەند دەکا شتێکی دیاریکراو ڕادەست بکا:

**پرسیار:** شێوازی جێبەجێکردن چۆن دەبێ ئەگەر بڕیارێکی دادگا بۆ جێبەجێکردن هێنرایە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن کە تێیدا دادگای بەرایی فەرمان بە حوکمدراو دەدا کەلوپەلی ناوماڵ ڕادەستی ژنەکەی بکاتەوە؟

**وەڵام:**

١) بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ماوەیەك بۆ قەرزار دیاری دەکا کە تێیدا کەلوپەلەکان ڕادەستی خاوەنقەرز بکاتەوە.

٢) ئەگەر قەرزار ڕازی نەبوو کەلوپەلەکان ڕادەست بکا ئەوا جێبەجێکردنی بەزۆر بۆ دەرهێنانی کەلوپەلەکان لە ژێر دەسەڵاتی قەرزار دەست پێدەکا.

٣) بەگوێرەی مەحزەرێك كە وەسفی كەلوپەلە دەستبەسەر داگیراوەكانی تێدا دەنوسرێتەوە، كەلوپەلەكان ڕادەستی خاوەنقەرز دەكرێنەوە.

٤) ئەگەر خاوەنقەرز گوتی قەرزار هەندێك لە كەلوپەلەكانی تێكداوە یان شاردویەتیەوە ئەوا وەسفی ئەو كەلوپەلانە لە مەحزەرەكەدا دەنوسرێتەوە و خاوەنقەرز (ژنەكە) ئاگادار دەكرێتەوە ئەگەر بیەوێ دەتوانێ لە دادگای پسپۆڕ داوای قەرەبوكردنەوە بەرز بكاتەوە و بەهاكەی بە پارە (كاش) بخەملێنێ.

٥) ئەگەر دادگا بەهای كەلوپەلی تێكدراو و شاراوەی بە پارە خەملاند ئەوا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێكردن ڕێكارەكانی جێبەجێكردن بۆ سەندنەوەی قەرزەكە دەست پێدەكا.

## ٤. جێبەجێكردنی سەنەدێك كە قەرزار پابەند دەكا بڕێكی دیاریكراو پارە بدا:

**پرسیار:** شێوازی جێبەجێكردن چۆن دەبێ ئەگەر بڕیارێكی دادگا بۆ جێبەجێكردن هێنرایە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێكردن كە تێیدا دادگا فەرمان بە حوكمدراو دەدا بڕێك پارە بداتە خاوەنقەرز ؟

**وەڵام:**

وەڵام :

١. (ب ج) داوا لە قەرزار دەكا كە ئارەزومەندانە لە ماوەیەكی دیاریكراودا قەرزەكە هەمووی بەیەكجار بداتەوە .

٢. ئەگەر قەرزار گوتی ناتوانێ هەمو قەرزەكە بە یەكجار بداتەوە ئەوا (ج د) داوای لێدەكا كە بە نوسین هەموو سامانە گوازراوە و عەقارەكانی لەگەڵ هەموو داهاتەكانی دەستنیشان بكا و پێشنیاری تەسویەیەكی گونجاو بكا.

٣. ئەگەر دەركەوت كە قەرزار ڕاستگۆ نیە لە دەستنیشانكردنی سامان و داهاتەكانی ئەوا (ج د) بەگوێرەی م ٣١ كێشەكە ڕەوانەی دادگای لێكۆڵینەوە دەكا بۆ ئەوەی ڕێكاری یاسایی بەرامبەر قەرزار بگیرێتە بەر بە تۆمەتی ئەوەی زانیاری درۆی داوەتە لایەنێكی ڕەسمی.

٤. (ج د) دەتوانێ مەبلەغی قستەكە زیاد بكا ئەگەر لەو قەناعەتە بوو قەرزار دەتوانێ بیدا

٥. ئەگەر خاوەنقەرز بە مەبلەغی قستەكە ڕازی نەبوو ئەوا دەبێ بیسەلمێنێ كە قەرزار لە توانای دا هەیە زیاتر لەو مەبلەغە بدا .

٦. ئەگەر قەرزار ڕازی نەبوو ئارەزومەندانە قەرزەكە هەمووی بەیەكجار یان بە قست بداتەوە و تانەشی لە بڕیاری دادگا نەگرت ئەوا ڕێكارەكانی جێبەجێكردنی بەزۆر لە دژی ئەنجام دەدرێ بۆ ناچاركردنی بۆ دانەوەی قەرزەكەی و مەسرەف.

٧. جۆرەكانی جێبەجێكردنی بەزۆر كە لەدژی قەرزار ئەنجام دەدرێ بە گوێرەی كەیس دەگۆڕێ .

٨. لە چوارچێوەی یاسا دەشێ سامانی قەرزار، یان بەشێكی دیاریكراو لە موچە و دەرماڵەی دەستی بەسەردا بگیرێ. ئەگەر قەرزار سامانەكانی شاردبوەوە ئەوا بە گوێرەی یاسا دەشێ زیندانی بكرێ.

## 5. جێبەجێكردنی بڕیاری دادگا كە حوكمدراو پابەند دەكا كە كارێكی دیاریكراو نەكا:

**پرسیار:** شێوازی جێبەجێکردن چۆن دەبێ ئەگەر بڕیارێکی دادگا بۆ جێبەجێکردن هێنرایە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن کە تێیدا دادگا فەرمان بە حوکمدراو دەدا کارێکی دیاریکراو ئەنجام نەدا، بۆ نمونە بە ڕێگایەکی تایبەت دانەڕوا؟

**وەڵام:**

١) بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن داوای بەڵێننامەیەکی دەستنوس لە حوکمدراو دەکا کە نەڕواتە ئەو ڕێگایە.

٢) ئەگەر لە ماوەیەی دیاریکراودا بەڵێننامەکەی نەهێنا ئەوا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن داوا لە دادگای لێکۆڵینەوە دەکا کە ڕێکاری یاسایی لە دژی دەست پێ بکا بە گوێرەی م ٣٥.

٣) بەڵام ئەگەر بەڵێننامەی هێنا و دواتر سەرپێچی کرد ئەوا داوای لێ دەکرێ جارێکی دیکە بەڵێننامەیەکی دەستنوس بهێنێ. ئەگەر بۆ نمونە فەرمانەکە دروستنەکردنی پەنجەرەیەك بوو دوای بەڵێننامەکە دروستی کرد ئەوا داوای لێ دەکرێ لای ببا ئەگەر نا لەسەر نەفەقەی ئەو لا دەبرێ.

٤) ئەگەر دیسان سەرپێچی کرد ئەوا بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن داوا لە دادگای لێکۆڵینەوە دەکا کە ڕێکاری یاسایی لە دژی دەست پێ بکا بە گوێرەی م ٣٥.

## ٦- جێبەجێکردنی بڕیاری دادگا کە حوکمدراو پابەند دەکا متاوعەی مێردەکەی بکا:

**پرسیار:** شێوازی جێبەجێکردن چۆن دەبێ ئەگەر بڕیاری دادگا فەرمان بە حوکمدراو بدا متاوعەی مێردەکەی بکا؟

**وەڵام:**

١) شێوازی جێبەجێکردنی فەرمانی متاوعە بەگوێرەی م.١١ جیاوازە لە شێوازەکانی دیکە چونکە جێبەجێکردنی بەزۆری تێدا نیە.

٢) داوا لە ژنەکە دەکرێ لە پێش جێبەجێکاری داد ئامادەبێ.

٣) جێبەجێکاری داد هوشیارکردنەوەی دەداتێ موتاوعەی مێردەکەی بکا.

٤) ئەگەر ژنەکە بڵێ کە ڕازیە یان ناڕازیە متاوعە بکا لە مەحزەرێك دەنوسرێتەوە و داوای لێ دەکرێ ئیمزای بکا.

٥) نوسخەیەك لە مەحزەرەکە کە ئیمزای ژنەکەی لەسەرە دەدرێ بە پیاوەکە.

٦) ئەگەر ژنەکە گوتی بە متاوعە ناڕازیە، یان ئەگەر دوای پێراگەیاندن لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ئامادە نەبوو ئەوا وا دادەنرێ کە بە متاوعەی مێردەکەی ڕازی نیە. لەم حاڵەتانە گەواهینامەیەك دەدرێ بە پیاوەکەی کە پشتڕاستی متاوعەنەکردن دەکاتەوە.

٧) لە حاڵەتی سەلمانی متاوعەنەکردن ئەوا دادگای پسپۆڕ حوکمی نشوز لەدژی ژنەکە دەردەکا کە لەوانەیە ببێتە هۆکاری تەفریق و لەدەستدانی مارەیی.

## ٧- جێبەجێکردنی بڕیاری خێرای دادگا کە حوکمدراو پابەند دەکا نەفەقەی کاتی بدا:

١) دادگای پسپۆڕ کە تەماشای کەیسی نەفەقە دەکا (کە لەلایەن ژن لەسەر پیاو، ئەسل لەسەر فەرع، یان فەرع لەسەر ئەسل بەرز کراوەتەوە) بۆی هەیە هەر لە سەرەتاوە بڕیارێکی خێرا دەربکا کە فەرمان بە قەرزار بدا نەفەقەی کاتی بە خاوەنقەرز بدا بۆ گوزەرانی ژیانی ڕۆژانەی تاوەکو داوایەکە بەتەواوی یەکلا دەبێتەوە و نەفەقەی بەردەوام دەردەچێ.
٢) بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن داوا لە قەرزار دەکا کە ئارەزومەندانە نەفەقە بڕیاردراوەکە بدا.
٣) ئەگەر قەرزار هەرکاتێك ڕازی نەبوو ئارەزومەندانە بڕی نەفەقە بڕیاردراوەکە بدا ئەوا ڕێکارەکانی جێبەجێکردنی بەزۆر لە دژی ئەنجام دەدرێ بۆ ناچارکردنی بۆ دانەوەی بڕی نەفەقە و مەسرەف.
4) وەك ئیستیسنا لە ڕێسای یاسایی دەکرێ قەرزار لەسەر نەدانی نەفەقە زینندانی بکرێ تەنانەت ئەگەر خزمی پلەیەکی خاوەنقەرزیش بێ.
5) وەك ئیستیسنا لە ڕێسای یاسایی دەکرێ لەسەر نەدانی نەفەقە دەست بەسەر سامانی قەرزار دا بگیرێ تەنانەت ئەگەر خاوەنقەرز داوایشی نەکردبێ.

## ٨. جێبەجێکردنی بڕیاری دادگا کە حوکمدراو پابەند دەکا نەفەقەی بەردەوام بدا:

**بڕیاری نەفەقەی بەردەوام بە دوو شێوە جێبەجێ دەکرێ:**

**١) ئەگەر حوکمدراو موچەخۆری دەوڵەت بوو:**

بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن فەرمانگەکەی ئاگادار دەکاتەوە کە مەبلەغە دیاریکراوەکە لە موچەکەی ببڕێتەوە و مانگانە ڕادەستی بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردنی بکا.

**٢) ئەگەر حوکمدراو موچەخۆری دەوڵەت نەبوو:**

بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن ڕۆژێکی بۆ دیاری دەکا کە مانگانە مەبلەغەکە ڕادەستی بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردنی بکا.
ئەگەر قەرزار هەرکاتێك ڕازی نەبوو ئارەزومەندانە بڕی نەفەقە مانگانەکە ڕادەست بکا ئەوا ڕێکارەکانی جێبەجێکردنی بەزۆر لە دژی ئەنجام دەدرێ بۆ ناچارکردنی بۆ دانەوەی بڕی نەفەقە و مەسرەف.

## ٩. جێبەجێکردنی بڕیاری دادگا کە حوکمدراو پابەند دەکا تەڵاقدراو لە خانووی هاوسەرگیری نیشتەجێ بکا:

**پرسیار:** شێوازی جێبەجێکردن چۆن دەبێ ئەگەر بڕیاری دادگا بەگوێرەی م.٤ لە «یاسای مافی ژنی تەڵاقدراو لە نیشتەجێبوون» ژمارە ٧٧ ساڵی ١٩٨٣ ڕێگا بدا ژنە تەڵاقدراوەکە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لە خانووی هاوسەرگیری بمێنێتەوە ؟

**وەڵام:**

١) لەسەر داوای ژنەکە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن پیاوەکە ئاگادار دەکاتەوە کە لە ماوەی دیاریکراودا ئارەزومەندانە خانووی هاوسەرگیری چۆڵ بکا.

٢) ئەگەر قەرزار رازی نەبوو ئارەزوومەندانە خانووەکە چۆڵ بکا،ئەوا ڕێکارەکانی جێبەجێکردنی بەزۆر لە دژی ئەنجام دەدرێ بۆ پێچۆلکردنی خانووەکە و دانەوەی مەسرەف.

٣) بەرامبەر هەر ڕۆژێك دواکەوتن لەوەی چۆڵی بکا، پیاوەکە « ١٠٠ دینار» غەرامە دەکرێ.

٤) ئەگەر خانووەکە هی پیاوەکە خۆی بوو ئەوا بێ کرێ تا ٣ ساڵ تێیدا دەمێنێتەوە. ئەگەر کرێچی بوو ئەوا ماف و پابەندییەکان بۆ ژنەکە دەگوازرێتەوە.

## ١٠. جێبەجێکردنی بڕیاری دادگا کە حوکمدراو پابەند دەکا عەقاری بەکرێدراو چۆڵ بکا:

١) بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن حوکمدراوەکە ئاگادار دەکاتەوە کە عەقاری بەکرێدراو چۆڵ بکا و خاڵی لە کەلوپەل ڕادەستی بکاتەوە.

٢) یاسای بەکرێدانی عەقار ژمارە ٨٧ ساڵی ١٩٧٩ لە م.٢٢ دەسەڵاتی تەقدیری تا ٣ مانگی داوە بە جێبەجێکاری داد کە مۆڵەتی حوکمدراو بدا لە چۆلکردندا لەو ڕۆژەوە ئەژمار دەکرێ کە خاوەنقەرز داوای جێبەجێکردنی بڕیاری دادگا لە بەڕێوەبەرایەتی جێبەجێکردن دەکا.

٣) ئەگەر قەرزار (کرێچی حوکمدراو) رازی نەبوو ئارەزوومەندانە لە ماوەی یاساییدا خانووەکە چۆڵ بکا،ئەوا پێڕاگەیاندنی بۆ دەنێردرێ کە لە (ب ج) ئامادە بێ.

٤) دوای ئەوەی حوکمدراو دێ یان دەهێنرێتە (ب ج) ئەوا (ج د) حوکمدراوەکە ئاگادار دەکاتەوە کە عەقاری بەکرێدراو چۆڵ بکا و خاڵی لە کەلوپەل ڕادەستی خاوەنقەرزی بکاتەوە.

٥) ئەگەر قەرزار (کرێچی حوکمدراو) رازی نەبوو ئارەزوومەندانە لە ماوەی یاساییدا خانووەکە چۆڵ بکا،ئەوا پێڕاگەیاندنی بۆ دەنێردرێ کە لە (ب ج) ئامادە بێ.

٦) دوای ئەوەی حوکمدراو دێ یان دەهێنرێتە (ب ج) ئەوا (ج د) حوکمدراوەکە ئاگادار دەکاتەوە کە عەقاری بەکرێدراو چۆڵ بکا و خاڵی لە کەلوپەل ڕادەستی خاوەنقەرزی بکاتەوە.

٧) یاسای بەکرێدانی عەقار ژمارە ٨٧ ساڵی ١٩٧٩ لە م.٢٢ دەسەڵاتی تەقدیری داوە بە جێبەجێکاری داد کە لەسەر داوای حوکمدراو / کرێچی تا ٩٠ ڕۆژ مۆڵەتی حوکمدراو بدا لە چۆلکردندا لەو ڕۆژەوە ئەژمار دەکرێ کە خاوەنقەرز داوای جێبەجێکردنی بڕیاری دادگا لە (ب ج) دەکا.

٨) ئەگەر قەرزار لەو مۆڵەتەی پێی دراوە خانووەکەی چۆڵ نەکرد، ئەوا پێڕاگەیاندنی بۆ دەنێردرێ کە لە ماوەی ٣ ڕۆژ چۆڵی بکا.

٩) ئەگەر لەو ٣ ڕۆژەش چۆڵی نەکرد ئەوا بە ئامادەبوونی فەرمانبەرێکی (ب ج) کرێچییەکە لە عەقارەکە دەردەهێنرێ و عەقارەکە ڕادەستی خاوەنعەقاری حوکمبۆدراو دەکرێتەوە.

١٠) ئەگەر کرێچی رازی نەبوو کەلوپەلەکانی ببا، بە ئەمانەت لای کەسی سێیەم هەڵدەگیرێ یان لەسەر نەفەقەی کرێچی بۆی هەڵدەگیرێ.

١١) ئەگەر لە ماوەیەکی مەعقول کە (ج د) دیاری دەکا کرێچی نەهات کەلوپەلەکان ببا ئەوا بە مەزادی ئاشکرا دەفرۆشرێ و نرخەکەی دوای دەرهێنانی مەسرەف وەك ئەمانەت بۆ کرێچی هەڵدەگیرێ.
١٢) ئەگەر لە ماوەی ٥ ساڵ لە ڕۆژی دوای ئاگادارکردنەوەی لە ڕۆژنامەدا نەهات بۆ وەرگرتنەوەی پارەکە یان سامانە عەینیەکە ئەوا وەك داهاتی گەنجینەی گشتی دادەنرێ (م ١١٧ یاسای ج)

## چی دەبێ ئەگەر قەرزار خانووەکە ڕادەست بکاتەوە بەڵام کەلوپەلی تێدا بەجێ بهێڵێ؟

ئەگەر قەرزار خانووەکەی ڕادەست کردەوە بەڵام کەلوپەلی تێدا بەجێهێشت ئەوا جێبەجێکاری داد ماوەیەکی گونجاو دەدا بە قەرزار کە بێت و کەلوپەلەکانی بباتەوە. بە ئەمانەت لای کەسی سێیەم هەڵدەگیرێ یان لەسەر نەفەقەی کرێچی بۆی هەڵدەگیرێ.

ئەگەر لە ماوەیەکی مەعقول کە (ج د) دیاری دەکا کرێچی نەهات کەلوپەلەکان ببا ئەوا بە مەزادی ئاشکرا دەفرۆشرێ و نرخەکەی دوای دەرهێنانی پارەی مەسرەف لە مەبلەغی فرۆشتنەکە باقی پارەکە وەك ئەمانەت بۆ قەرزار هەڵدەگیرێ (م ٣٩ یاسای جێبەجێکردن).

ئەگەر لە ماوەی ٥ ساڵ لە ڕۆژی دوای ئاگادارکردنەوەی لە ڕۆژنامەدا نەهات بۆ وەرگرتنەوەی پارەکە یان سامانە عەینیەکە ئەوا وەك داهاتی گەنجینەی گشتی دادەنرێ (م ٤٠ ، م.١١٧)

( خالص احمد حمد )